# فەلسەفەی ئەخلاقی
# و
# کۆمەڵایەتی ئۆگۆستین

## (حکمەت لەلای ئۆگۆستین)

نووسینی
**د. عەلی زەیعور**

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
**خەبات عەبدوڵلا**

کوردستان - هەولێر
٢٠٠٦


**ناوی کتێب:** فەلسەفەی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ئۆگۆستین
(حکمەت لەلای ئۆگۆستین)
- **نووسینی:** د. عەلی زەیعور
- **وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:** خەبات عەبدوڵلا
- **نەخشەسازی ناوەوە:** طـە حسین
- **بەرگ:** سەیوان
- **سەرپەرشتی چاپ:** هێمن نەجات
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **ژمارەی سپاردن:** ٣٢٠
- **چاپی یەکەم:** ٢٠٠٦
- **نرخ:** ١٠٠٠ دینار
- **چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**زنجیرەی کتێب** - ٢٢ - (١٢٥)



**ناونیشان**
**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**
**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@ maktoob.com
**ژمارەی تەلەفۆن:** 2260311
www.mukiryani.com




## ناوەڕۆك


أ- حكمەت .................................................... ٧

ب- زانستە زەرووریيەكان بۆ حكمەت ............................ ٨

ج- پوختە، پلەكانی تر لە بەرزبوونەوەی نەفس ........................ ٩

**خۆشبەختی لەلای قەشە ئۆگۆستین لە فەلسەفەی بەختەوەری** ......... ١٢

أ- دەبێت ئێمە بۆ چ ئارەزوومەندبین .............................. ١٣

ب- زانیاری و تیۆری بەختەوەرگەری ئۆگۆستینی .................. ١٦

ج- تاوتوێكردن لەسەر بەختەوەرگەری ............................ ١٧

**هزرە رامیارییەكان** ............................................. ٢٦

أ- شاری خودا .................................................. ٢٦

ب- سەرهەڵدانی كۆمەڵگا ...................................... ٣٣

ج- سەرچاوەی دەسەڵات ....................................... ٣٥

د- یاسا لە كۆمەڵگادا .......................................... ٣٨




فەلسەفە لە خۆشویستن و پەیوەستبوون بە حکمەتەوە سەرچاوە دەگرێت و دێتە ئاراوە، حکمەتیش جۆرێکە لە زانست و زانستیش هەموو زانیارییەکی یەقینییە کە هیچ گومانێکی پێنابردرێت.

بۆیە حکمەت شیاوی ئەوە نابێت کە ببێت بەزانیاری مەگەر خەسڵەتەکانی یەقینی رەهای پێوە دیارنەبێت یاخود ئەگەر بەشێك نەبێت لە زانیاری زانستی، چونکە حکمەت جۆرێکە لە رەگەزێك کە زانستە، بۆیە ناکرێت تێکەڵ بە یەکتری بکرێن، بەڵکو دەبێت لێکتر جیابکرێنەوە، و ئاشکراشە کە یەکێکیان دراوە بە خەڵکانێك (مەبەست لێرە حکمەتە) و ئەوی تریشیان (کە زانستە) بە خەڵکانێکی تر.

حکمەت زانیارییەکە کە چالاکییە باڵاکانی نەفس دەهێنێتە بەکارهێنان، واتە چالاکییە ناوەکییەکانی مرۆڤ (نەوەك ئەوەی لە رەواڵەتی مرۆڤدا هەیە) و لێکچوونێك و هاوبەشییەکی بۆ دروستدەکات لەگەڵ ئاژەڵدا) ئێمەین هەستەکانمان بەراورد دەکەین و بڕیاریان بەسەردا دەدەین و دادگاییان دەکەین... بەم جۆرە و بە شێوەیەکی دیاریکراو و تایبەت ئەو مرۆڤە ناوەکییە یاخود ئەوەی کە لە ناخمانەوە بوونی هەیە ئەو مرۆڤە یا (هزرە- فکر). بە شێوەیەکی دیاریکراو و تایبەت.



کەواتە حکمەت بەم شێوەیە شوێن (ئەقڵ- هۆش- زیرەکی Intilcet)، ئەقڵ بەواتای (عللەت) Rqison ، دەکەوێت.

ئەو (مەبەست حکمەتە) کارێك نییە، بەڵکو تێڕوانینێکە بەرەو نەمری و هەمیشەییی دەڕوات نەوەك بەرەو ئەوەی کە کاتییە.

حکمەت خەسڵەتێکی هاوبەشانەی گرتۆتە خۆ و خاوەندارییەتی ئەو بۆ تاکێك ناگێڕدرێتەوە یاکورت ناکرێتەوە، هەروەها تاك ملکەچی کۆمەڵ دەکات نەوەك کۆمەڵ لە پێناو بەرژەوەندییەکانی تاك بەکاربهێنرێت یا بچەوسێندرێتەوە. ئەمانە هەمووی زانست رەنگ پێدەدەنەوە.

بەلاّم بەڵگە نەویستە کە حکمەت پێوستی بەزانستە بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی. ئاکارباشییەکانیش (الفضائل)، کە بریتین لە رێگا شیاو و چاك و گونجاوەکان بۆ مامەڵەکردن و رەفتارکردن، مەرجی زانینی چۆنیەتی مامەڵەکردن و هەڵسوکەوت کردن دەسەپێنن. بەم جۆرە زانست دەبێتە ئامرازێك بۆ حکمەت و ملکەچی دەنوێنێت. بەلاّم ئەمە واناکات کە زەروورەت و شەرعییەت و سەلاّحییەتی خۆی لەدەستبدات (مەبەست زانستە) یاخود مەرج نییە بە ئامرازێکی بەکارهاتوو (لەلایەن حکمەتەوە) دابنێین، دەتوانین بیکەین بە رێگایەك بۆ وەدەستهێنانی حکمەت.





له كۆتاییدا حكمەت دەگات بە ئامانجەكانی خۆی كاتێك كە هزرە هەتاهەتایی و نەمرەكان دەگرێتە خۆی.

بەم جۆرەش قەشە ئۆگۆستین رەخنە لە چەمكە یۆنانییەكەی حكمەت دەگرێت (ئەو چەمكەی كە بۆی بەكارهاتووە). ئەو وادەبینێت كە حكمەت زانینی شتە ئیلاهییەكان بێت، لەكاتێكدا كە زانینی شتە مرۆییەكان تەنها بۆ زانست دەگێڕدرێتەوە و دراوەتە پاڵ ئەو.

## أ- حكمەت:

سەرەتا نەفس دەستدەكات بەپاككردنەوەی خۆی لە هەموو چڵكنی و پیسەكان و هەوڵی پاكی و بێ گەردی و بێ خەوشی (سازگاری) و بێ بەریەتی لە ئاست هەموو ناپاكییێك دەدات بە نیازی كرانەوەی خودی ئەو لە بەرامبەر ڕووناهی یەزدانی.

لە توێژبەندی ئۆگۆستینی، قۆناغی یەكەم بە ترس لە یەزدان دەستپێدەكات، واتە: بە ترس لە مەرگ و لە چارەنووسی دوارۆژ. دواتر قۆناغی دووەم كە خۆپاراستنە (الورع - التقوای- piētē) بەواتای: ملكەچی بۆ كتێبە پیرۆزەكان و رازیبوونێكی باوەڕدارانە بە راستی و دروستی یان دێت. دەتوانین قۆناغی سێیەم بە سوودوەرگرتن لە هەموو ئەو زانستانە دابنێین كە بە زانستە پێویست و زەروورییەكان دەژمێردرێن بۆ حكمەت.



## ب- زانستە زەروورییەكان بۆ حكمەت:

پێویستە یا دەخوازرێ كە زانینێكی باشمان سەبارەت بە نووسراوە پیرۆزەكان هەبێت، بۆ ئەوەی توانایی شیكردنەوەو باس لێوەكردن و راڤەكردنیانمان هەبێت. بۆیە زانینی ئەو زمانانەی كە پێیان نووسراون كارێكی ویستراوە، بەڵكو زۆرجار بۆ زانینی سروشتی ئەو بوونەوەرانەی كە باسیان لێوەكراوە- لە كتێبە پیرۆزەكان- دەبێت پەنا بۆ زانستی كانزاكان و رووەك و گیاندارەكان، هەروەها جوگرافیا و میكانیك (زانستی فێڵ)، گەردوونناسی بەرین.

زانینیان بەزەرووری دادەنرێت، چونكە توانای رێگەدانی هەیە بە وەڵامدانەوەی گوماناوی و سۆفیستەكان، هەروەها رەوانبێژی و زمانپاراوی و زانستی ژمارەكان و مێژوو و یاسا، ئەمانە گشتیان ئەو بەشانە پێكدەهێنن كە نابێت پشتگوێ بخرێن. هەر هەموویان ملكەچی حكمەتن، دەبێت باوەڕداران سوود لە بێ باوەڕان و بتپەرستان وەرگرن و لێیانەوە فێربن و جگە لە قسە هەڵبەستراو و سەرشێواوەكانیان هیچی تریان لێ رەتنەكەنەوە.

قەشە ئۆگۆستین نموونەی كاری عیبرانییەكانمان بۆ دەهێنێتەوە، كە لە چەندین جارەی ئاماژەپێكردن و دووبارەكردنەوەی- و بەپێی ئەوەی لەسەرەوە لێوەی رەتبووین- وادیارە كەوا ئەوان (مەبەست عیبرانییەكانە) كاتێك لە میسر دەرچوون هەرچی كەل و پەل و قاپ و ئامانە زێڕین و زیوونییەكان و خشڵ و جلوبەرگی میسرییەكان





هەبوو بەپێی توانا لەگەڵ خۆیانیان برد، هەروەك مووسا خۆشی ئەوەی کردووە کە لەسەر دەستی زانا میسرییەکان فێربووە، و ئەوەی راستەقینە بووە لایان رەتی نەکردۆتەوە.

## ج- پوختە، پلەکانی تر لە بەرزبوونەوەی نەفس:

بەم جۆرە حکمەتی ئاییینی زانست و زانیارییەکان ریزبەند دەکات لە ژێر دەسەڵاتی کتێبە پیرۆزەکان کە هەڵگری ئەو راستەقینە رزگارکارییەن کە لە یەزدانەوە بۆ مرۆڤ سروشکراون. بەرزبوونەوەش بەردەوامە- کە لە قۆناغی چوارەمی تویژبەندی حکمەت- لە دوای بە یەکجارەکی وەرچەرخانی نەفس رووەو پەروەردگار- ئەو (نەفس) هەوڵی مانەوە و بەردەوامی دەدات لەسەر ئەو دۆخە پاکسازییە (نقاوە)ی کە پێیگەیشتووە. لە قۆناغی پێنجەمدا، ئەوا نەفس بەرەو یەزدان دەڕوات، واتە بەرەو تێڕوانین لە راستییەکان بە متمانەیەکی رەهاو کامڵەوە. لەو ساتانەدایە کە خودی خۆی بە نزیك دەزانێت لە بەرزترین و قووڵترین خەڵات - پاداشت- کە هەوڵی بۆ گەیشتن پیێ دابوو.

لە قۆناغی شەشەم، نەفس (بینایی) دیدی خۆی ئاراستەی ئەو یەزدانە دەکات کە ناتوانرێ تەنها (یا جگە) لە رێگەی دڵەکانەوە نەبێت تێترامێنی بکرێت دواتر  قۆناغی حەوتەم دێت کە بریتییە





لە تێرامان و بینینی (حەقیقەت) راستییەکان کە ئالێرەدا دەبێت دۆزرابێتەوەو وەدەستهاتبێت ئەم حەقیقەتەش حکمەتە.

کە وابێ حکمەت کۆتایی رێگا رۆیشتنێکی دوورودرێژە، کە لە دوایی بڕینی حەوت قۆناغدا پێیدەگەین یاخود بە شێوەیەکی روونتر، لە دوایی مانەوە لە هەریەکێك لەم قۆناغانەداو تێگەیشتن و نواندنیان (ئەو) حکمەت خۆشییە، ئەو بەدەستهێنانی خێری رەها و کۆتایی و راستەقینەیە. لێرەدا مرۆڤ پێویستی بە بەخشینی (نعمەتی) یەزدانییە بۆ رزگاری بوون و گەیشتن بە یەکەمین بنەما (المبدأ الاول) بۆ گشت شتەکان، بە بالاترین عیللەت، بە دروستکار. لە کۆتاییدا، دەڵێین: کە دانپێدانانەکانی ((الاعترافات)) زۆرینەی نەخشە فیکری و تیۆرە ئۆگۆستینییەکان دەگرێتە خۆی.

لەم کتێبەدا ((ئۆگۆستین)) دەڵێت: حکمەت هەمیشەییە (هەتاهەتایی و بێ کۆتاییە).(حکمەت) ئەو بنەمایەیە کە هەموو شتەکان لێیەوە سەرچاوە دەگرن و هەڵدەهێنجرێن، بەم پێیەی کە بینیمان دەتوانین بڵێین کە حکمەت لەگەڵ وشە (الکلمة)دا یەکگرتووە، یاخود هەر خۆی وشەیە*.

* وشەی یەزدان لە لای ئۆگۆستین بریتییە لە: کوڕەکەی، ئاکارباشییەکەی، حکمەتەکەی، (راستییەکانی) حەقیقەتەکەی.

حکمەتی سروشتی لە ئەوەوە وەردەگیرێت و دادەماڵدرێت، چونکە ئەوە رووناکی ئەقڵەکان و دڵەکان و فراوانکەر و تەواوکەری حکمەتی سروشتییە. هەرگیز حکمەتی هەمیشەیی لوتکەی ئامانجەکانە کە دەبێت بانگەشەی بۆ بکرێت.



## خۆشبەختی لەلای قەشە ئۆگۆستین

## لە فەلسەفەی بەختەوەری

هەر لەو کاتەی کە ئۆگۆستین کتێبەکەی (هۆرتانسیۆس)ی خوێندەوە لە خۆشویستنی حکمەت نەپچڕا، کە ئامانج و مەبەستی فەلسەفەیە، ئەو حکمەتەی کە بووە هۆی سەرلێشێواوی و گومان بۆ دروستکردنی و دواتر وەرچەرخان و دواتر رێنمونیکردنی.

ئۆگۆستین هەر لە سەرەتایی بیرکردنەوەکانی تا کۆتایی هەڵسا بە جووتکردن و لێکدانی حکمەت و بەختەوەری، چونکە بەختەوەری ئەو چێژەیە کە هیچ چێژێکی تر لە دوایەوە نایەت، و پێوست لابەرە بۆ هەموو چێژێکی تر، و ئاشتی ناوەکی دەبەخشێت. ئەمە وادەگەیەنێ کە ئامانجی قەشە زۆر پراکتیکی بووە، چونکە خاوەن رێبازێکی بەختەوەریگەرانە (التنضير في السعادة /Euedemonisme) بووە، لە کاتێدا کە هەمیشە مرۆڤ خاوەن چارەنووسێکی دڵەڕاوکێ ئامێزە لە ئاست گەڕان بەدوای بەختەوەریدا کە هەر هەموو مرۆڤەکان گەڕەکیانە و بەدوای دادەگەڕێن.





دەرچوونی (ق. أ)* لە خاڵێکی سوقراتییانەیە: بەختەوەری پێوستی بە ئاکارباشییە و گرتوویەتە خۆی. لەلایەکیترەوە، ئارەزوو بۆ بەختەوەری غەریزەیەکی سروشتییە (پاڵنەر یا پێگەرێکی سروشتییە) کە لە قوڵایی یادگار یا بیرەوە جێگیرە و یەزدان بە مرۆڤی بەخشیوە بۆ ئەوەی بە هۆیەوە بگەڕێتەوە بۆ لای و رووەو ئاسمان ئاراستەی بکات.

### أ- دەبێت ئێمە بۆ چ ئارەزوومەندبین:

دەبێت ویستەکانمان سەقامگیری و بەردەوامیان پێوە دیاربێت، بە بەخت و رێکەوت نە بەستراوبن. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی کە جگە لە خواوەند (کە تەنها ئەو هەمیشەییە و بەردەوام و نەمرە) هیچی تر نییە نەمر بێت بۆیە ئارەزوو یان ویستی ئێمە بۆ یەزدان، مانای ئارەزوو و حەزی (حەقیقی) راستەقینەن و هەروەها رێگایەکی راست و گەیەنەریشە بە بەختەوەری، بەم شێوەیە گوماندارە ئەکادیمییەکان هەرگیز ناتوانن بەختەوەربن چونکە ئەوان خاوەنی حەقیقەت (راستییەکان) نین. حکمەتە کە بەختەوەری گرتۆتەخۆی و شادی ئامێزە، ئەم بەختەوەرییەش ناسینی یەزدان دەگرێتەخۆی یا گەیشتنە بە ئەو، کاتێکیش کە گوماندارەکان ناتوانن یا

* قەشە ئۆگۆستین.





نایانەوێت بگەن بەخواوەند یان بە ناسینی ئەوا هیچێك نە لە بەختەوەری و نە لە حکمەت بەدەستناهێنن.

پڕی و بەختەوەری: ئەو بەختەوەرییەی کە باسی لێوەدەکرێت خێرێکی رۆحییە (گیانییە) کە لە دەستدانی هەموو خێراتە ماتەرییەکان (ماددییەکان) نابێتە هۆی لە دەستدانی یا رۆخانی، بەڵام ئەو پێوستیشی بە پڕێتی هەیە (plenituele) کە دژە لەگەڵ هەموو کەموکورییەك و نیگەرانییەك. ئەو پڕییەتییە راستەقینەش نایەتە ئاراوە، مەگەر ئاستێك لە یەکسانی و دادپەروەری پێوە دیارنەبێت، واتە نەکەم و نەزیادبێت، بەڵکو پارێزگاری لەسەر مامناوەندییێتی و رەبەقێکی گونجاوی نەبێت. کەواتە پڕێتی ئەو مامناوەندیەتییەیە کە رۆح بە هۆیە لە هەموو زێدەرۆی و لەرادەبەدەرێك (وەکو: تموح، و زەنگینی، و خۆبەزلزانی...هتد) و لە هەموو کەمایەتییەك (وەکو: نەفس نزمی، و وەحشییەتگەری، و ئێسك قورسی، نیگەرانی، و شەهوەت و گشت رەوشت نزمییەکان کە مرۆڤ نزم و بچووك دەکاتەوە رزگاری دەبێت.

کەواتە پڕێتی- مامناوەندی- واتا حکمەت، حکمەتیش واتا بەختەوەری. حکمەت لە دیدگای ئەو - وەکو بینیمان- بە هەمان شێوە گشت ئەوانە دەگرێتەوە کە کتێبە پیرۆزەکان لێیەوە دواون، کە حکمەتی یەزدانە. قەشە پۆلس دەڵێت: **کوڕی خوا جگە لە حکمەتی خوا شتێکی دیکە نییە. بەڵام کوڕی خوا هەمان خوایە.**

بۆیە دەتوانین بڵێین کە ئەوەی یەزدان دەدۆزێتەوە (دەیناسێت) لە هەمانکاتدا حکمەت و دواتریش بەختەوەری دەدۆزێتەوە و چنگی دەکەوێت، لەلایەکی تر حکمەت چییە مەگەر حەقیقەت نەبێت وەك وتراوە ((من حەقیقەتم)).

خەڵك بە گشتی بانگەشە بۆ بەختەوەری دەکەن کە بریتییە لە خاوەندارێتی باشترین و چاکترین شتەکان، بەڵام ئایا باشترین شت بۆ ئەوان چییە؟ باشترین شت بۆ مرۆڤ خودی مروڤ خۆیەتی، یاخود ئەمەیە کە لە ئەو بەرزوباڵاترە، و جگە لەوانە هەموو شتێك لە ژێرترە (لە ئاستیدا نزمترە)، بۆیە نابێت ئاوات بۆ شتێك بخوازرێت کە لە ئەو نزمترن. نەفس بەرزترە لە لاشە، و خێری باڵا دەبێت بۆ شتە بەرزەکان بێت، بۆیە بۆ ئەو نەفسە دەبێت کە بەرزترین شتە لە مرۆڤدا.

لەلایەکی تر (ئەگەر بپرسین) دەبێت ئاکارباشی (فەزیلەت) چی بێت؟ فەزیلەت خێر و چێژە بۆ نەفس و کامڵبوونی نەفسە، کە خۆشی پێ دەبەخشێت. وەك ئەوەی کە تام و چێژی راستەقینە (حەقیقی) بەردەوامە -چۆن لە سەرەتاوە باسمان لێوەکرد- یەزدانیش بەردەوامە (نەمرە)، بۆیە گەیشتن بە یەزدان بریتییە لەو چێژە راستەقینەیەی کە دواتر مانای بەختەوەری دەگەیەنێت.



### ب- زانیاری و تیۆری بەختەوەرگەری ئۆگۆستینی:

ئالێرەدا تیۆری ئۆگۆستین گرفتێك هەڵدەکات: ئایا بەختەوەری لەلای ئەو لە زانین دایە؟

لە زانیاری زانینێکی زۆر بەرز؟

جلسون رازی نییە بەوەی ئەم تیۆرە بۆ هیچ تیۆرێکی تر بگێڕدرێتەوە. دروستە کە بەختەوەری ئۆگۆستینی پەیوەستە بە راستەقینەوە و لێی جیانەکراوەیە، و راستەقینە (حەقیقەت) لە ناخی دایە و گرتویەتیە خۆی، هەروەها بابەتێکی جیا نییە و دوور نییە لە زانیاری، بەڵام زانیاری نییە و نابێت وا مامەڵەی لەگەڵ بکەین حەقیقەتیش نییە، چونکە حەقیقەت لە خودی خۆیدا نەبۆتە ئامانجی بەختەوەری تەنها لەبەر ئەوەنەبێت کە خەیرە. دواتر زانینی حەقیقەت بە تەنیا ئامانجی مرۆڤ نییە، بەڵکو ئەو پێویستە وەك مەرجێکی سەرەکی بۆ گەیشتن بەم ئامانجە (کە بەختەوەرییە).

بەکورتی، بەختەوەری لە حەقیقەت لە دایکبووە، و لێك جیاناکرێنەوە. تیۆری ئۆگۆستینی دەربارەی بەختەوەری جیاوازە لەگەڵ تێڕوانینی رێبازی ئەقڵی یۆنانی بۆی (المذهب العقلي اليوناني). هەروەها جگە لەمە ئامانجی سەرەکی حکمەتی ئۆگۆستینی، بریتییە: لە زانیارییەك کە رێگە خۆشکەر و





گەیەنەرە بەیەزدان. کەمێکی تر دەچینە سەر ئەو جیاوازییانە کە لە نێوان هەردوو ڕێبازەکەدا هەن.

### ج- تاوتوێکردن لەسەر بەختەوەرگەری لەلای ئۆگۆستینۆس و ڕێبازە یۆنانییەکان:

دوای ئەوەی ئۆگۆستین گوتی- وەك ئەوەی ئەفلاتوون دەیڵێت لە «ئۆدیم»- کە هەمووو مرۆڤێك بە دوای بەختەوەرییەوە وێڵە، هەڵسا بە گەڕان بە دوای جیاوازی پێناسەکانی لە نێو خەڵکی جیاوازدا.

دەگێڕنەوە یا باسدەکرێت کەوا (ڤارۆن varron) لە فەلسەفەدا (٢٨٨) تیۆری دەربارەی بەختەوەری نووسیوە و کردوویەتی بە سێ بەشەوە:

ئەمەی کە لە نەفسەوەیە، ئەمەی کە لە جەستەوەیە، ئەمەی کە بۆ نەفس و جەستە دەگەڕێتەوە.

**١- ڕەواقییەکان بانگێشە بۆ ئاکارباشی (فەزیلەت) دەکەن:** ئەمەی کە لە نەفسدایە وەك بنچینەیەك بۆ بەختەوەری. تاکێکی ڕەواقی نەگرنگی دەدات و نەدەکەوێتە ژێرکاریگەری کۆمەڵە شتێك یا بابەتێك کە پەیوەندیان بە ئەوەوە نییە و بێ باکە و پشتگوێخەرە لە ئاست: سامان و سەروەت، ناودەرکردن و ناوبانگی و، شکۆمەندێتی، و ڕاوقسەی خەڵك لە سەری. ئەمانە هیچیان ڕەواقی ئەرکیان پێناکێشێت و لەکاری ئەو نین.



لەلایەکی ترەوە ئەو حوکمڕانە بەسەر هەمموو ئەوانەی کە پەیوەندییان بە ئەوەوە هەیە. بەوەی ئەو دەیخولقێنێت و دەیکات وەکو ڕایەکان و ئەحکامەکان و حەز و ئارەزووەکان و ڕق وکینە و مەیل و خۆشەویستی بۆ بەرامبەر.

ئەمانە شتگەلێکن کە پەیوەندیان بەرەواقییەوە هەیە. ئینجا لێرەدا پێویستە ئەو هیچ نەکات جگە لەوەی کە بیانخاتە ژێر ویستی خۆیەوە، و خۆشی لەسەرویان دابنێت بە جۆرێك کە هیچ کارێکی تێنەکەن یاخود کاریگەرییان لەسەر نەبێت.

بە هۆی ئەم ویستە بەهێزەیە کە هیچ شتێك نایجولێنێ و نایدۆڕێنێ، لەم هەڵوێستە بەختەوەری بەدەست دەهێنێت، بەڵام ئۆگۆستین ئەم چەمکە بۆ بەختەوەری ڕەتدەکاتەوە، چونکە پێی وایە کە نەفس دەکات بەهەڵگری ئەوەی کە لەسەرووی تواناکانی ئەودان ئەمەش جۆرێکە لەتەرفاندن و ماندوکردنی تواناو هێزەکانی مرۆڤ، ڕەواقییەکان دەکەونە نێو خۆ بە گەورە زانینێکی کوێرانەوە بە سووربوون لەسەر ئەم گومانەیان. جگە لەمەش بەزووترین کات دەبینین کە نەفس دەتوێتەوە و بێ توانا دەبێت لە ئاست ئەو شادییە شلەژاو و جێ نەگێڕانە (وەك ئەوەی ڕەواقییەك تێیدەگات) هەرچەندە سەرتاپاو تەواو پاك و بێگەرد بێت. بەڵام خەفەکردنی چێژە جەستەیی و هەستۆکییەکان بەکارێکی دژ بە سروشت دادەنرێت و تەسککردنەوەیە بۆ (چەمکی) مرۆڤ و





بەکپکردنەوەی توانا جەستەییەکان یا فەرامۆشکردنیان بە کۆتایی یەکجارەکی، ئەوە دەبێتە هۆی لاوازی بوون و بێ هێزبوونی نەفس کە پەیوەندی بەو لاشەیەوە هەیە. وەلێ هەولّی دەسەلاّت سەپاندن بەسەر هەستەوەرە جەستەییەکان جگە لە خەون (وهم) و خەیالّ هیچی تر نییە، و ئاکارباشی نییە ئەوەی جەستە ئازار دەدات یا فەرامۆشی دەکات.

**٢- ئەبیکۆرۆسییەکان بەختەوەری لە چێژ و لەزەتە هەستەوەرییەکانەوە دەبینن:** بەلاّم ئۆگۆستین دەلّێت ((شێتایەتییە کە بەدوای بالاّترین بەختەوەری بگەڕێین لە شەهوەتدا)) و ڕایەکەی ئەبیکۆرۆس ڕایەکی پووچ و دوورە لە ڕاستی، چونکە هەرگیز نەفس ملکەچی جەستە نییە، نە بەختەوەریش سەرچاوە لەو چێژو ڕابواردنە هەستۆکییانە وەردەگرێت کە تێرنابێت و تێرنابێت، بەلّکو هەموو ئاودانێك تینووتری دەکات.

دەزانین کە ئۆگۆستین لە سەرەتایی تەمەنی لە شوێنکەوتەی ئەبیکۆرۆسی و ڕێبازی هەستی Sensualism بووە، بۆیە دەبینین بەزانینەوە هێرش دەبات و ئەمە بە توندی ڕەتدەکاتەوە.

**٣- دەربارەی ئەفلاتوون، ئۆگۆستین –بەوەرگرتن لە شیشرۆنەوە- دەلّێت:** کە ئەو بەختەوەری لە حکمەتی یەزدانی نەگۆڕەوە دەبینێت کە یەکسانە بەخودی خۆی و ئەو مەشخەلّەیە کە ڕووناککەرەوەی هەموو حکمەتێکی مرۆییە. بەلاّم ئۆگۆستین



تیۆرەکەی ئەفلاتوون و ئەفلۆتین بە کامڵ و ڕۆشن نازانێت، چونکە نەیتوانیووە ڕۆڵی یەزدان لە گەیشتن بە بەختەوەری دەرك بکات (کاتێك کە لەلای هەردووکیان یەزدان خۆی ناناسێت، جیهانیش ناناسێت، بایەخ بە مرۆڤ نادات و نیعمەتی پێ نابەخشێ). بەڕای ئۆگۆستین خێری کامڵ لەوەدایە کە نەفس ڕووەو سروشتێکی بەرز بڕوات کە لەژێر ڕووناکی یەکەیدا نەفس ڕۆشن بەخش و ڕۆشن بکاتەوە و بەختەوەرییەکی بەپیت و مەزموونکراوی پێ ببەخشێت، کەواتە ئارەزوی (ویستەکانی) مرۆڤ تێر نابێت تەنها لەڕێگەی یەزدانەوە نەبێت. ئەمەش وا دەگەیەنێت کە کاتێك مرۆڤ قووڵ دەبێتەوە لە حەز و ئارەزووی بۆ بەختەوەری واز لە تێڕوانین و دیدگای ڕەواقی و ئەبیکۆرۆسییەوە دەهێنێت بۆ بەختەوەری. لە بری ئەودا، بەدوای پڕبوون و نەمری -هەمیشەیی-دا دەگەڕێت کۆڵینەوە بەدوایان لە خودی یەزدان.

خێری بالاّ بۆ هەربوونەوەرێك ئەوەیە کە دەیخاتە نێو کاملّترین (باشترین) حالّەت. (باشترین) بەپێی ئەوەی کە نەفس جەستە دەخاتە جوولّەکردن و ژیانەوە، بۆیە هیچ شتێك لە نەفس چاکتر نییە و چێژوەرگرتن ئەو لە هەموو لەزەتێك باشترە.

هەروەها لە هەموو شەهووەتێك و قوەتێك -هێزێك- یان جوانییەك یاخود هەرچی هاوشێوەی ئەمانەیە لەچێژ و لەزەتە جەستییەکان لەگشتیان چاکترە. ئەمە نەفسە کە دەیخاتە حالّەتی





زیندوویەتی و ژیانەوە، کەوابێ ئەو چاکترین و باڵاترین خێرە بۆی.
ئەو نەفسەش بەکامڵبوون ناگات لەڕێگای خودی خۆیەوە، ئاکارباشی لەناخی خۆیدا نادۆزێتەوە. چونکە ئەم ئاکارباشییە لە دەرەوەی ئەودا بوونی هەیە. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین کە مرۆڤ دوو جۆرە ژیانی هەیە. ژیانی جەستە کە پەیوەستە بە نەفس، و ژیانی نەفسیش کە پەیوەستە بە یەزدان.

نەفس بە شوێنکەوتنی یەزدان ئاکارباشی (فەزیلەت) وەدەست دەهێنێت و بەم دەستکەوتەش دەگات بە بەختەوەری. لەلای یەزدانەوەیە کەوا ئاکارباشی (فەزیلەت) و بەختەوەری بەیەکدەگەن و ئێمەش بە گشتی بە ئارەزووەکانمان دەگەین. لە کۆتاییدا، تیۆری ئەفلاتوون دەربارەی چوار فەزیلەتەکە (دادپەروەری- حکمەت- ئازایی و بوێری- پاکیزەیی و داوێن پاکی، عیفەت) لەلایەن ئۆگۆستینەوە وەردەگیردرێت و دەیانکات بە خۆراکی ڕاستەقینەی ژیانی ئەخلاقی-ethos life- و ژیانی ئەو کۆمەڵگایانەی کە ناتوانێ ژیان هەڵبکەن بەبێ پشتبەستن و ملکەچبوون بۆ ئەم یاسا ئەخلاقییانە. بەڵام ئەو ئەمەش زیاد دەکات کە ئەم ملکەچ بوونە بەبێ هەبوونی ئایینێك زۆر زەحمەت و قورسە، و ڕوونەداوە بەبێ بەخشینی نیعمەتێك لەیەزدانەوە.

**٤- حوکمێکی گشتی و تێڕوانینێکی گشتگیر:** زۆر بە ئاسانی سەرنج لەوە دەدرێت کە بەختەوەری ئۆگۆستینی لەسەر



زەمینەیەك خراوەتەڕوو کە لە فەلسەفە تێپەڕ دەبێت، و جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە سەبارەت بەم بابەتە، لەلایەن مەزاهبە یۆنانییەکان و ئۆگۆستینەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئۆگۆستین بە شێوەیەکی گشتی و تارادەیێك لەنێوان ئەو دوو هەڵوێستەدا دەمێنێتەوە کە ڕەواقییەتی ڕۆمانی و بەختەوەری - خۆشبەختی و ئاسوودەیی- یۆنانییە. ئەمە لەلایەکە، لەلایەکی ترەوە، ئەو(بەختەوەری) بەرزترە لە هێز و تواناکانی مرۆڤ و زۆر ئەستەمە (تحقیق) و جێبەجێکردنی، و تایبەتمەندە یا دابینکراوە بۆ جۆرێك لە خەڵك کە توانایەکی دیاریکراو و ژیانێکی ڕۆحی (گیانی) دیاریکراویان هەبێت.

لەڕاستیدا، لەلایەن ئەوانەی کە لە کۆیی خەڵکیش پایەدارتر و لە باڵاترین حاڵەتی ڕۆحیدان ناتوانێ بەختەوەری بەدیبهێنن لەسەر ئەم زەمینە، چونکە ئەو پێویستی بە جیهانی دووهەمە بۆ بەدیهاتن. کەواتە (بەختەوەری) مۆرکێکی پوختەی ڕۆحی هەیە، ڕامانێکی تێڕامین (تأمل) سۆفی گەرانەیە، و ئاڕاستەکردنی نەفسە ڕووەو ئەو تێڕامینە سۆفیگەراییەو کە ئەوپەڕی چێژ و خێری باڵایە. بەکورتی بەختەوەری لە لەزەت و چێژە دونیاگەرییەکاندا نییە، چونکە بەختەوەری ئارەزوو و مەیلێکی سروشتییە کە لە یەزدانەوە بۆمان ڕەوانەکراوە -هەر لە ئەمیشەوە هەیە و لە ئەم بەختەوەری ڕاستەقینە بەدی دەکرێت.





له کۆتاییدا، قسەکردن و باسکردن دەربارەی ڕەوشت (ئەخلاق) لەلایەن ئۆگۆستینەوە هەمیشە باسکردنی بەختەوەری دەگەیەنێت، وەك بنەمایەکی یاخود کۆڵەگەیەکی سەرەکی لە زانستی ئەخلاقی ئۆگۆستینی. ئەو وتە بەناوبانگەکە ((خۆشویستنی یەزدانە)) Deus est charitasl caritas دڵ و ناوەڕۆکی بەختەوەری ئۆگۆستینی پێکدەهێنێت.

خۆشەویستی، بەمانا کامڵەکەی ئەم وشەیە، سەرچاوەی رەفتارو هەڵسووکەوتی مرۆییە. واتە خۆشەویستی من بریتییە لە توانای من بۆ سەرنجڕاکێشانی دەوروبەرم.

فەلسەفە یا فەلسەفەی ئەخلاق (الخلقیات) رەخنە لەو دیدگا ئایینییە دەگرێت کە ئازادی مرۆڤ پچڕ پچڕ دەکات، یاخود بڕیار بەسەر دراوی دەکات لەلایەن مێژوو و کۆمەڵگاوە. بەبێ ئەوەی خۆی توانای دارێژتنی یاساکانی هەبێت و دەیکات بە بابەتێك (موضوع)و وا مامەڵەی لەگەڵ دەکات لەو کاتەی کە خۆی خودە (ذاتە)، بە دەستەواژەیەکی تر:

١- ئۆگۆستین بایەخ و گرنگی و (ئەولەوییەت) دەدات بەوەی کە ڕوویداوە مەگەر لەسەر (حیسابی) ئەوەش بێت کە دەبێت ببێت. ڕابردوو لەسەرووی داهاتووە، خولْقاندن (پرۆسەی خەلقکردن) کۆتایی پێهاتووە، بۆیە هیچ شتێك پێش ئەو ناکەوێت و هیچێکیش بۆی زێدە ناکرێت. لێرەدا دوو جۆرە ئەنجام دێنەکایەوە، یەکەمیان:



بێ هێزکردن و لاوازکردنی ئازادییە یاخود بە جارێك لابردن و سڕینەوەیەتی. دووهەمیان: باسکردنە بۆ جۆرێك لە قەزاو قەدەر کە هیچ ناگونجێت لەگەڵ ئەو بوون و ئازادییەی کە بە مرۆڤ بەخشراوە.

٢- لە تیۆری ئۆگۆستینی خۆشەویستی بە نرخی یەکەم دەژمێردرێت و تاکە نرخیشە. لەڕاستیدا ئینجیل ئاماژە بۆ مەترسی ئەمە دەکات و دەڵێت ((لە ماڵی باوکم مەنزڵگای زۆر هەیە)). بەکورتی، پوختەی باسکردن تەنها سەبارەت بەدڵ و نرخەکەی، ئێمە دووچاری مەترسیەك دەبینەوە ئەویش ئەمەیە: کە دڵ دەکات بە پیشەکارێك کە دوور وەستاوە لە هەرچی هزر و کار و ژیانی هەستیارییە. واتە فەلسەفەی خۆشەویستی فەلسەفە نییە. خۆشەویستی فەلسەفەیەکی تاکانە و یەکانە و تاکڕەو نییە. خۆشەویستی بەبێ زانین و زانیاری کوێربوونە، و بەبێ هونەر کەم و بێ مانایە، و بەبێ بنەماو ڕێسایەك نارێکی و نابینایییە. تاکڕەوی لە ئەخلاق و لە هەموو شتێك، بێ توانای دەکات لە شیکردنەوەی تەواوی شتەکان- نە بە هیچ دەگات و نە گشتگیریشە-بەپێی ڕای تایبەتیمان- ئەمەش لە هەموو زانستە مرۆییەکان پەیڕەو دەکرێت. ئۆگۆستین ئەوەندە جەخت لەسەر خۆشەویستی دەکاتەوە تاڕادەیەك پێدەچێت ئەو هەرشتێك جگە لە ئەو رەتدەکاتەوەو نەفی دەکات.

خۆشەویستی بێ هیوابوون نییە (هەروەها لە دوای ئەمەش) بیرۆکەیەکی لە دوای سروشت نییە یا بەرزەڕۆو پێشینە نییە، و





توانای دۆزینەوەی چارەسەرییەکانی نییە لە جیاتی ئەقڵ، و نەتوانای رەتکردنەوەی واقیع و ئەوەی لۆژیکییە یا هەر هەمەجۆریەك و هەمەڕەنگێك یا هەر هەست و سۆزێکی رۆشن و دیار یا تاریك و نادیار لە مرۆڤدا.



## هزرە رامیارییەکان

ئۆگۆستین زانا یا بیرمەندێکی سیاسی نەبووە، بیروبۆچوون و عەقیدەکەی لە زۆربەی لایەنەکانییەوە بێ بەرییە لە سیاسەت، بەلاّم لەگەڵ ئەمەش زانیاریگەلێکی هەستپێکراوی سەبارەت بەم بوارە خستۆتەڕوو. کە کارێکی زۆریان کردۆتە سەر چەمکەکان و ژێدەرە کۆمەلاّیەتی و سیاسییەکانی سەدەی ناوەڕاست.

### أ- شاری خودا:

شاری خودا، کە مەبەستی سەرەکی بەرپەرچدانەوەی تۆمەتی بتپەرستان بوو کە دەیانگوت مەسیحییەکان خواوەندی رۆمایان توڕەکردووە، هەموو ئەم تاوتوێکردنانەی کۆتایی پێهێنا کە بوونیان هەبوو، بۆ ئەوەی ببێت بەجۆرە بیرکردنەوەیەك سەبارەت بە مێژوو و شار زێتر شێوەی تێرامانێکی (تأمل) گرت نەوەك (لەلایەك) شێوەی ئایینزایەکی بە رێبازکراو بگرێت کە سۆزو هەستی گڕگرتووی باوەڕدارێك وزە بەخشی بێت یاخود لەلایەکی ترەوە شێوەی هەستی رۆمانییەك بگرێت کە لە ئاست رووخانی ئیمپراتۆرییەتەکەیدا سەرلێشێواو دلّگران و خەم خۆرە و حەز بە کۆتایی هاتنی ئەم دۆخە دەکات.





شاری خودا جۆرە کارلێککردنێك و ئاشناییەکی تێدایە لە نێوان ژیاری یا شارستانییەتی چەرخی کۆن و شارستانییەتی مەسیحیدا، وەك ئەوەی پردێك بێت لە نێوان ئەم دوو شارستانییەتە و ڕوونکردنەوەیەك و لێکدانەوەیەك بێت بۆ پرۆسەی گواستنەوە لە ئەوەوە بۆ ئەو. واتە دەتوانین بیچوێنین بە جۆرە تێڕوانینێکی گشتگیر بۆ مێژووی ڕۆمانی. لە کتێبەکەیدا کۆمەڵێك ئیتروحات (أطروحات) و چەمکی یاسایی و کۆمەڵایەتی هەیە کە تا ئێستاش کاریان پێدەکرێت و هەر بە زیندوویەتی ماونەتەوە، وەکو: یاسای سروشتی، و شەرعییەتی دەسەڵات، و ئازادی سروشتی مرۆڤ، و نەژادی بەزۆر دەسەڵاتی حوکمکردن و یاسای دادپەروەرانە و شەرعی... هتد.

سەبارەت بە شێوەی دەوڵەتیش ئۆگۆستینۆس ئاماژەی بە پەسندکردنی هیچ شێوەیەکی دیاریکراو نەکردووە. بەڵام جەختی لەسەر ئەمە کردۆتەوە کە عیللەتی (هۆی سەرەکی) هەبوونی دەسەڵاتی سیاسی چەسپاندنی یا بەرقەراربوونی عەدالەتە (یەکسانییە).

لەبەر ئەوەی کە (بەبێ عەدالەت و یەکسانی)، پادشا جگە لە دزێکی پۆشراو بەشکۆ هیچی تر نییە و مەملەکەتیش جگە لە ئەشکەوتێك نەبێت بۆ دزو جەردەکان هیچی کە نییە. لەمەوپێش گوتمان کە کتێبەکەی بریتییە لە ئیۆلۆژیای سیاسەت زێتر لەوەی کە عەقیدەیەك بێت دەربارەی زانستی سیاسەت. لێرەدا تیۆرەکەی



پشت بە دابەشکردنی دوولایەن دەبەستێت بۆ شار و بۆ سەرتاپای مرۆڤایەتی: کە شاری خودا، و شاری زەمینی (دونیایی)یە. ئەم دابەشکردنەشی لەسەر بنەمای خۆشەویستییە، کە جۆری یەکەمی بریتییە لە خۆشویستنی خود بەپلەیەك کە خودا تیایدا لەبیردەکرێت. ئەمەیە کە دواتر شاری دووهەمی لەسەر دادەنرێت یا ئەوی لێ دەکەوێتەوە، جۆری دووهەمی خۆشەویستیش بریتییە لە خۆشویستنی خودا تارادەی خود لە بیرکردن و خۆ بەکەم زانین کە ئەمەیان دواتر شاری خودای لێ دەکەوێتەوە. ئەم دوو شارە هەر لە سەرەتایی بوونەوە (خەلیقەتەوە) شان بەشانی یەکتر بوونیان هەبووە، و هەر لەگەڵ یەکتر بەردەوام دەبن تا ڕۆژی قیامەت (حەشر- دەینونە).

شاری ئاسمانی: دامەزرێنەرەکەی قابیینە، و بەر لە هاتنی مەسیح درووی لەسەربێت بە ئۆرشەلیم (القدس- پیرۆزکراو) ناوزەد کرابوو و ببوو بە شوێنی تائیفەکاری مەسیحییەکان، جگە لە حەج و لە مەنفا نەبێت لەسەر ئەرزدا هیچی تر نییە. بە شاری ئاسمانی ناوزەد دەکرێت و کار لە پێناوی سەروەری عەدالەت و یەکسانی دەکات. یەزدان دامەزراندنی ئەم شارەی خستۆتە ئەستۆی کڵێسا و خۆشی یارمەتیدەری دەبێت، شارێك کە ملکەچی یەزدان بێت، و ئارام و لەسەرخۆ، و ئاشتیخواز و بێ زیان بێت، ڕاستی پەسند دەکات نەوەك پیاهەڵدانی هەڵفرێنەر و ستایشی لەڕاستی بەدوور.





بۆ خەڵك ئەوەی دەوێت کە بۆ خۆی پێیخۆشە و دەیەوێت. خۆشەویستی و رێز لە هاوسێ دەنێت. واتا ئەو شاری مەسیحە، سەرۆك و دامەزرێنەرەکەی مەسیحە. ئەم شارە شاری باوەڕە. شاری نەتەوە باوەڕدارەکان و خەڵکی خۆپارێزەرە.

شاری زەمینی: شوێنگەی دەسەڵاتە سیاسییەکانە بە ئەخلاقەکانیانەوە و بە مێژوو و بە داخوازییەکانیان... هیچ شارێك لەم چەشنە ناتوانێ کامڵ بێت، چونکە پشتگیری لە چەوسانەوە و ستەم دەکات، و بەردەوام لەگەڵ شاری یەکەم (شاری ئاسمانی) لە جەنگدایە. واتە بابلییە (شاری بەلبەلە و شڵەژاوییە) شاری خراپەکارانە و تیایدا خۆشەویستی پاك و بێ خەوش نییە. هەروەها لەگەڵ خودا نەگونجاوە، ئیرەبەرە (حسود) و حەز بەژێردەستکردنی ئەوانی تر دەکات و لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی هاوسێ و ناسیار ژێردەست دەکات، لەژێر سەرکردایەتی فریشتە شەڕانگێزییەکاندا کۆدەکاتەوە و لەناو ئاگردا ژیان بەسەردەبن.

ئەو شاری شەیتان، و ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە بە باوەڕەوە ناژین و شاری نەتەوە کافرەکانە ئەم بیرۆکەیەی ئۆگۆستین شتێکی تازە و نوێ نییە. چونکە لەسەرەتادا لە توراسی قەشە پۆلس و لەلای ئۆریجین، مەگەر بە شێوە ناوکەییەکەشی بێت، بەدی دەکرێت.بەڵام ڕاستییەکە ئەمەیە کە قەشە ئۆگۆستینۆس بەهایەکی روونکراوەی



پێ بەخشی و لەلای ئەو بیرۆکەیەکە کە بەڕێوەبەرایەتی ڕێچکەی مێژوو دەکات و ڕووداوەکانمان بۆ شیدەکاتەوە.

پەیوەندی لە نێوانیان: باسمان لەوە کرد کە ئەوان (مەبەست دووشارەکەیە) هەر لە سەرەتایی ڕۆژگارەوە بەیەکەوە بوونیان هەبووە، هەر لەگەڵ یەکتری دەبن تا هاتنی ڕۆژی دوایی (دەینونە). لە نێوانیان دژایەتی و جەنگ هەیە. لە دوای ئەمە شاری زەمینی لادەچێ و نامێنێ بۆ ئەوەی ئەوی تریان بە نەمری بمێنێتەوە، وەك نەمری قەشەکانی لە ژیانی دوایی.

بێگومان، ئەم دوو شارە دژبە یەکن، چونکە لەسەر دوو بنەمای تەواو و جیاواز لە یەکتری دامەزراون کە (خۆشەویستی زات، خۆشەویستی خودایە). بەڵام وێڕای ئەمە (ئەم دژایەتییە) تێکەڵاوبوونی ئەوان لەم دونیایە ڕەتناکرێتەوە. لەسەرەتادا ئیسرائیلییەکان نوێنەری شاری یەکەم بوون و هەموو نەتەوەکانی تر نوێنەرایەتی شاری دووهەمیان دەکرد. کاتێك کە مەسیح (دروودی لەسەربێت) هات ئەم جیاکارییە (تمایزە) کۆتایی پێ هات.

(دوو شارەکە) گەڕانەوە بۆ تێکەڵ بەیەکتری بوون هەروەك چۆن وابوون لەسەرەتایی دروستبوونەوە (خەلقەوە) هەتاکو هاتنی ئیبراهیم (دروودی لێ بێت) ئیمرۆش ئەوان بەیەکەوەن و تێکەڵ بەیەکترن. شاری ئاسمانی سوود لەو خێراتانەی شاری زەمینی وەردەگرێت و بەشداری یەکتری دەکەن. وەلێ خێراتی یەکەم





بریتییە لە کۆمەڵە ئامرازێك بۆ دابینکردنی بژێوی ژیان، و پارێزگاریکردن لە تاك و جۆر (النوع) کە بۆ جێبەجێکردن و بە دەستهێنانی خێری باڵا یا هەرە بەرز پێوستە کە بریتییە لە بەختەوەری تێکەڵ بە ئاکارباشی (فەزیلەت).

بەم جۆرە پەیوەندی لە نێوان دەوڵەت و کڵێسا دروستدەبێت و پلەبەندی دەکەوێتە نێوانیانەوە. لێرەدا ئۆگۆستین بە ئاشکرا کڵێسا لە پلەی یەکەم دادەنێت و ئەولەوییەتی پێ دەبەخشێ (کە ئەمەیە دواتر لە پاش ئۆگۆستین بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی کڵێسا بەکاردەهێنرێت). هەروەها ئەو جارێکی تر پێشبینی بۆ رژێمی کاتی (زمنی) دەکات کە سوود و کەڵك لە فەرمایشتەکانی وەرگرێت.

کۆمەڵێك پێیان وایە کە ئەو دوولایەنییە لە هزری ئۆگۆستینۆسی مانەوی یا بتپەرستی مانەوییەتەوە هاتووە کە کاریگەری لە گشت عەقیدەکەی کردووە. هەندێك لە مێژووناسان تارادەی ئەوە دەچوون کە جۆرە لێکدانێك هەبێت لە نێوان گرفت و کێشە تیۆلۆژییەکەی ئەم دوو شارە لەگەڵ ئەو گرفت و کێشانەی کە لە نێوان کڵێساو دەوڵەت هەبوون لە چەرخی ئەودا.

واتا ژێرخانی دابەشکردنی ئۆگۆستینی بۆ شار و مێژوو، لە ناخی کۆمەڵگای ئەوکاتە یا لە واقیعی مێژوویی ئەوکاتەدا هەبووە. وەك ئەوەی لایەنە (المعضلات) سیاسییەکان و کێبەرکێی لەسەر



دەسەڵات لە نێوان کڵێسا و دەوڵەت بنچینە بووبێت و ڕاوبۆچوونە ئۆگۆستینییەکانیش بریتی بووبن لە ڕەنگدانەوە و خەون و خەیاڵ و بیرکردنەوە دەربارەی گیروگرفتە سیاسییەکان.

لەڕاستیدا، لە دوایی ئۆگۆستینۆس قوتابییەکانی ڕۆڵیان بینی لە فراوانکردنی پانتایی لە نێوان دوو شارەکەدا. یاخود ئەوان بوون شاری زەمینییان کرد بە شاری شەیتان. لە کاتێکدا کە ئەو. أ. لەچڕی ئەم ئەسەنییەت و بێ باوەڕییەی کەمکردەوە بەوەی کە دەیگوت: تەنها یەزدانە ئەوان لێکتر جیادەکاتەوە و شاری زەمینی تەنها خراپی و کەموکوڕی نییە و ئەوەی دەربارەی دەوترێت ئەوەیە کە شکۆمەندییەکانی کاتی و لەناوچوونە (زائلە)و هەرچی لەسەر زەمینە لە شتی جوان و سوڵتان و شتی لەم بابەتانەوە هەموویان کاتین و بەردەوام نامێنن و تایبەتمەندییەکانی ئەو وەك تایبەتمەندییەکانی و ڕاستییەکانی شاری یەزدانی نین. لێرەدا دەبینین کە چۆن نزیك دەبێتەوە لە دیدگای ئەفلاتوونی بۆ خێرەکان بە ڕادەی ئەوەی کە لە هەمانکاتدا بیرکردنەوەیەك و هەڵسەنگاندنێکی مانەوی هەیە، کە جیاوازی لە نێوان هەر دوو شارەکەدا جیاوازییە لە ناوەڕۆك. لەلایەکی ترەوە، دانان و کردنی تیۆری ئۆگۆستینی دەربارەی کۆمەڵگا و سیاسەت بە ڕەنگداوەیەك بۆ واقیعی سیاسی ئەوکاتەدا بەلاوازکردن و کەمکردنەوەیەکی ئێکجار زۆری بیروبۆچوونەکانی ئەو دادەنرێت و گەڕاندنەوەی هەرچی بابەتی فیکری و هزرە بۆ هەرچی ماتەری و





واقیعییەو گەڕاندنەوەی هەرچی گشتگیرو فراوانە بۆ ئەوەی کە تەسك و سنووردارە. لە کاتێکدا ئاماژەدان بە هەبوونی کارتێکردنێکی ئاڵوگۆڕ و تێکەڵاو گوتەیەکی ڕاست و دروستە، چونکە ئیمکانییەتی (جدل) دیالێکتیك کردن لە نێوان لێوارگرو بەرزرۆییەکان، یا لە نێوان ڕەها و ڕێژەییەکان، و لە نێوان ئایدیالی و جێبەجێکەری دامەزرێنەر ڕەتناکاتەوە.

## ب- سەرهەڵدانی کۆمەڵگا:

بۆ تێگەیشتن لەسەرهەڵدانی کۆمەڵگا. بەسەرنجی گردبوونەوەیەکی گشتی بدرێت بۆ ئامادەبوونی کارێکی شانۆیی. بینەران بەبێ ئەوەی یەکتر بناسن و بەبێ ئەوەی کۆمەڵگایەك پێکبهێنن بەیەکەوە گرددەبنەوە. بەڵام کاتێك یەکێك لە ئەکتەرەکان بەهرەدار دەبێت ئەمە وادەکات دڵگیربوونی (أعجاب) هاوبەشیان جۆرە ئاشنایی و تەباییەك لەگەڵ یەکتریدا ئاڵوگۆڕ بکەن. ئەگەر ئەمانە دەستیانکرد بە گۆڕینەوەی خۆشەویستی لەگەڵ یەکتردا ئەوە بە هۆی ئەو ئەکتەرە خاوەن بەهرەیەکە لە خۆشویستنی هەموویان بەشداریان کردووە. بەڵگەشمان بۆ ئەمە کە هەرچەندە دڵگیربوونمان زێتربێت بۆی ئەوەندە زێتر چەپڵەی بۆ لێدەدەین، بەڵکو وا لە ئەوانی تریش بکەین کە چەپلەی بۆ لێبدەن و ژمارەیان زۆرترو زۆرتر بکەین. لەوانەشە جۆرێك لە ناتەبایی و کینە بکەوێتە نێوانمان و نێوان ئەوانەی کە چەپڵەی بۆ لێنادەن و



بەشداریمان ناکەن بۆ دەرخستنی سەرسامی  و دڵگیربوونمان پێی. بەم شێوەیە خۆشەویستی بۆ هەر شتێك بە شێوازێکی لەخۆوە (عەفەوی) کۆمەڵگایەك پێکدەهێنێت لە هەموو ئەو تاکانەی کە بەشدارن لە خۆشویستنی و بەدوورخستنەوەی یا دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەوانەی کە خۆشیان ناوێت. ئەوەی یەزدانی خۆش بوێت ئەوە بەپێی ئەم کارە خۆی لە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی دەدۆزێتەوە لەگەڵ گشت ئەوانەی کە خۆشیان دەوێت. کەواتە خۆشەویستی ئەو گرێبەندی کۆمەڵایەتییە و پەیوەندییە لە نێوان تاکەکان و دامەزرێنەری کۆمەڵگایە، کەواتە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە بەشداری لە خۆشەویستی یەکێك دەکەن کە کۆیان دەکاتەوە ئەوە ((شار))ێك پێك دەهێنن. بەفرە رەنگی و هەمەجۆری خۆشەویستی شارەکانیش هەمەجۆردەبن. کەواتە ژمارەی شارەکان یەکسانە بە ژمارەی جۆری خۆشەویستییەکان. لەبەرئەوەی کە لە نێو مرۆڤ دووجۆرە خۆشەویستی هەیە، بۆیە دەبێت بێگومان دوو جۆرە شار هەبن کە بە تەنها رێکخەری گشتی کۆمەڵگا مرۆییەکانن (کە پێشتر لەمیانەی قسەکان باسیان لێوەکرا) لەلایەکی تریشەوە، هەر کۆمەڵگایەك ئامانجێکی دیاریکراوی خۆی هەیە کە هەموو تاکەکان تیایدا بەشدارن، چونکە ئەوەی کە کۆمەڵگا خۆشی دەوێت و داوای دەکات، ئەوەیە کە تاکەکان دەیخوازن - کە ئاشتییە- جەنگەکانیش هەر بۆ بەرقەراربوونی ئاشتییە نەوەك بۆ شەڕکردن. و ئاشتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە





بەهۆیەوە ویستی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا تێردەکرێت یاخود بەجێ دەهێنرێت.

کەواتە، نەتەوە (میللەت) بریتییە لەو کۆمەڵە خەڵکەی کە لە شاردا دەژین. (میللەت) گردبوونەوەیە، بەشداریکردنی ژمارەیەك لە بوونەوەری هۆشمەندە کە کۆبوونەتەوە بەهۆی کاریگەری ویست و ئارەزوویان بۆ هاوبەشیکردن لەوەدەستهێنانی ئەوەی کە خۆشیان دەوێت. میللەتیش بەهۆی (فعلی) خۆشویستنی تاکەکان و حەز و ویستان یەکگرتوو و بەردەوامە.

## ج- سەرچاوەی دەسەڵات:

هەموو دەسەڵاتێك سەرچاوەیەکی خواوەندی هەیە، هەموو دەسەڵاتێك بنەما لە یەزدانەوە وەردەگرێت تەنانەت لە شاری زەمینیش. ڕاستە ئۆگۆستینۆس لێرەدا زۆر لە توراسی پۆلسی دوورنەکەوتۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەمۆرکی ئەو (ئۆگۆستین) چەمکی یاسای سیاسی بۆماوەی چەندین سەدە لەچاپ دەدرێتەوە. دەسەڵات تەفویزێکی ئیلاهییە، بەڵام مارەسەکردنی لەوانەیە بە هۆی بەختەوە یا ڕێکەوت یاخود بە ڕێگای بۆماوە یان هەڵبژاردنەوە بێت. یەزدان پشتگیری لەو سستەمە فەرمانڕەواییە یان لە ئەوەی تر ناکات و کەسایەتی ئەم سەرۆکەش یان یەکێکی تر دیاری ناکات، چونکە ئەوانە کۆمەڵە بابەتێکی وردەکارن،



گرنگ تیایدا (جەوهەر) ناوەڕۆکی ئەو دەسەلاتەیە کە لە ئەرك و وەزیفە سیاسییەکاندا بەدی دەکرێت.

لەم دابەشکردنە - لە نێوان ماتەری سیستەمی حوکم و دواتر ناوەڕۆکی دەسەڵات، گەڕانەوەیەکی ئۆگۆستینییە بۆ دابەشکردنێکی ئەفلاتوونییە ڕێباز.

لەلایەکی ترەوە، پەیوەندییەکی تر هەیە لە نێوان دەسەڵات و خواوەندییەتی: چونکە چاودێری یەزدانی ڕێگا بە دەوڵەت و سیستەمەکانی حوکم (فەرمانڕەوایی) نادات کە بەبێ ئامانج و بەبێ پلان و نەخشە بچنە ڕێگاوە. بەڵکو یەزدان هەموو شتێك ڕێك دەخات، و هەموو ولاتێك- لە هەموو چەرخێکدا- دەخاتە ژێردەستی ئەو ڕژێمەی حوکمکردن (فەرمانڕەوایی) کە دەگونجێت لەگەڵ ئەو هەرێمە. بۆ هەر ولاتێك یەزدان جۆرە سیستەمێك دەبەخشێت کە شایەنیەتی. تەنانەت ڕووخانی (سبی) ڕۆما شتێك بوو کە شایەنی بوو، چونکە ڕێڕەوی ڕووداوە مێژووییەکان و چیبووەکان بەپێی نەخشەیەکی یەزدانییەوە دێنە ڕوودان. لێرەدا بیرۆکەیەك هەیە کە (Bossuet) ((بۆسۆیە)) دەیگرێتە خۆی سەبارەت بە تێگەیشتنی لە مێژوو. و لە دواییدا بۆسۆیە دەڵێت: یاسای گشتی ئەوەی فەرمانڕەوایە و تەحەکم بەگشت ڕووداوە مرۆییەکان دەکات، نەخشەیەکە لە چاودێری ئیلاهی. کە بەپێی ئەوەوە هەموو کەموکوڕییەکان و خراپەکاری ئیمپراتۆریەتەکان





ڕێکخراوبوون هەر لەسەرەتادا سەبارەت بە میللەتی هەڵبژێردراو- بژاردە (الشعبي المختار) ئەوەی کە مەسیح لێوەی هاتەدەر، دواتر پاش مەسیح، و سەبارەت بەکڵێساکەی. بەم شێوەیە قەشە ئۆگۆستین بەپشتبەستن بەتوراسی پۆلسییەوە دەگات بەوەی کە سوڵتانی حاکمی ستەمکار لەلایەن و بەئاگایی یەزدانەوەیە. بۆیە پێویستە لەسەر مەسیحییەکان ئەم ستەمە قبوڵکەن و لە ئاست ستەمکار خۆڕاگربن (ئارام گربن)، چونکە ئەم ستەمە بێهۆنییەو ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە لەلایەن یەزدانەوە. بۆیە دەبێت لەجێی شۆڕش گوێڕایەڵی هەبێت. لەمەش گرنگتر ئەمەیە کە سیاسەتی ئۆگۆستینی پەیوەستە، بەناوەڕۆکەوە، بە تیۆلۆژیاکەی (ئەوەی بە تیۆلۆژیای سیاسە ناوی دەبرد). چ لەلایەن ناوەڕۆکی دەسەڵاتەوە بێت یا لەلایەن پەیوەندی ڕێچکەی مێژوو بەچاودێری یەزدانەوە. یەزدان جۆرێك لە شەرعییەت دەبەخشێت بە دەسەڵات لە خودی خۆیدا. بەبێ ئەوەی زەمانەتی یا کەفالەی مارەسەکردنی واقیعی و کارەکی ئەم دەسەڵاتە بکات. جگە لەمەش لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەموو کارێکی سیاسی کەوتۆتە ژێر چاودێریکردنێکی پەروەردگارییەوە.



### د- یاسا لە کۆمەڵگادا:

قەشە ئۆگۆستین جیاوازی دەکات لە نێوان دووجۆرە یاسا، لێرەدا یەکەمیان:

### ١- یاسای هەمیشەیی:

یەزدان ڕەهایە و بوونی هەیە (موجود)، ئەمە بنەمای هەموو ڕێسایەك و هەموو پێوەرێك و هەموو گونجانێك و هەموو ژمارە و کێشێکە. بەپێی داناترین و عاقڵترین و گونجاوترین یاساوە تەگبیرسازی بۆ ئافەریدەکانی دەکات. و یەزدان چاودێری مرۆڤ دەکات بەهەمان شێوەی چاودێریکردنی بۆ چۆلەکەکان، ڕۆحەکان، دەنکۆڵە خۆڵێك، چاودێری ئەو هەموو شتێك دەگرێتەوەو لە هەموو گەردوون بلاوە دەکات. ئەگەر بڕوانین واقیع یا بکەین دەبینین کە تاوان و پەژارەو ئازار لەخۆوە دەگرێت. ئەمەش وا لە هەندێك دەکات ئیدعایی نەبوونی یەزدان بکەن، بەبیانووی ئەو نەگەتیڤیانەی کەهەن، بەڵام ڕاستی ئەمە نییە. چونکە یەزدان (موجودە) بوونی هەیە، و لە نەبوونەوە شتی دروستکردووەو خولقاندویەتی. و یاسایی هەمیشەیی هێناوەتە داهێنان و هەموو شتێکی ملکەچی سیستەمێك کردووە: لاشە بۆ ڕۆح، و خواروو بۆ سەروو، و سەرووش بۆ ئەوەی بەرز و باڵاترە، ئینجا بەم شێوەیە تا





دەگەین بە بەرزترین و بالاترین خێر و چاکەی هەمیشەیی و هەتاهەتایی.

لێرەدا ئۆگۆستین گرفتی هەبوونی شەڕ دەخاتەڕوو، کە ئایا چۆن شەڕ هەیە لەگەڵ سیستەمێکی کامڵ؟

یاسایی هەمیشەیی یاساییەکی چەسپاو و نەگۆڕە، کە ناگۆڕێت بەپێی شوێن و کاتەکان، چونکە لە هۆشی مرۆڤدا نەخشکراوە. ئەم هۆشە ڕووناك دەکاتەوە چۆن یا بە هەمان شێوەی ڕۆشنایی یەزدانی کە ئەقڵ ڕووناك دەکاتەوە. بەر لە ئێستا بینیمان کە مرۆڤ لە یەزدانەوە سیفەتی زەرووری (حوکم کردن) فەرمانڕەوایی وەردەگرێت. لە یزدان یاسایەك هەیە کە تەنها لە ئەودا هەی، کە هەر یەزدان خۆیەتی، ئەمیش یاسایەکە کە هەموو شتێك بۆی ملکەچە. ئەمەیە یاسایی هەمیشەیی و هەتاهەتایی و سروشتی کە چاودێری و سیستەم لە گەردووندا دەسەپێنێ.

ئەم یاسایە بریتییە لە جۆرێك نەویستی و ڕەتکردنەوەی کارەکی کە لەویژداندا بەدی دەکرێت. ئەو ڕیسایانە جۆرە گریمانێکی دیاری تێدایە کە لە ڕێگای ئەقڵ دەدۆزرێتەوە. و هەمان ئەو ڕەتکراوانەیە کە لەویژدانی ئەخلاقیدا دەیبینین. و هەرچەندە (شرائع)ەکان بگۆڕێت بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ داواکاری و پێداویستییەکان، لە خودی خۆیدا هەر سەرچاوە لەو تاك ڕیسایە وەردەگرێت کە ناگۆڕێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە یاسای



سروشتی بۆ دوو ڕێسا دەگەڕێتەوە: کارێك لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا مەکە کە ناتەوێت لەگەڵ تودا بکرێت، و دەبێت هەموو خاوەن مافێك مافەکەی خۆی وەربگرێت. لە خەسڵەتەکانی ئەم یاسایە: خەسڵەتی یا سیفەتی جێبەجێکردن (وجوب) و پاپەندبوونە (ألزام). کەواتە فەرمانکەرەو هیچ دەرفەتێك بۆ هەڵبژاردن ناهێڵێتەوە. یەزدان ئەم جیهانە بە شێوەیەکی ڕەها و تەواو بەڕێوە دەبات. ویستی ئەو ڕێسایە بۆ هەموو ویستە مرۆییەکان کە پێویستە چاکە کاربێت، نەوەك دژ بە ویستی خودا بووەستێت، ئەم وەستانە ستەم و شۆڕشێکە نەك هەر چەوتی و سەهو و هەڵەکارییەك. هەروەها یاسا گوزارشت لە ویستی خودا دەکات، ئۆگۆستین دەڵێت کە ویستی و هزری یەزدان هەمان شتە.

یاسا لە خودی خۆیدا چاکە و خێرە. بۆ ئێمەی مرۆڤیش جگە لەوەی خێرە ڕێنووێن و ڕێگا نیشاندەرە بەتەواوەتی.

سیفەتی دووهەمیش بۆ یاسای سروشتی ئەوەیە کە ویستراوە (لەلایەن مرۆڤ) و توانای سەرنجڕاکێشان و پاڵپێوەنان و بەکارخستنی مرۆڤی هەیە.

کەواتە ئەو ڕێگاکەرەوەیە بۆ ڕاودەستپێشخەرییە کەسییەکان و دەرفەتیان پێ دەبەخشێت و ڕەتیان ناکاتەوە.





لەگەڵ ئەوەی ئەم یاسایە (یاسای هەمیشەیی) بنەماکانی هەروەك خۆی دەمێنێتەوەو هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا ڕوونادات لەگشت شوێن و زەمانێك، بەلاّم دابونەریتەکان وا ڕێکدەخات کە بگونجێن لەگەڵ شوێن و کاتەکەیان.

## ٢- یاسای کاتی:

مرۆڤ ئافەریدەیەکی کۆمەلاّیەتییە. یەکەم پەیوەندی سروشتی لە نێوان پیاو و خێزانەکەی - هاوسەرەکەی- دروستدەبێت. دواتر پەیوەندییەکی تر زیاد دەکرێت یا دروستدەبێت بە هۆی لە دایکبوونی منداڵەکانەوە، لەگەڵ هەبوونی خزمەتکار خێزان خانەنشین پێکدەهێنێت. خانەنشین (المنزل) یەکەمین ناوکە بۆ شار. کۆمەڵە شارێکیش ڕەگەزی مرۆڤایەتی پێك دەهێنن یا دەنوێنن. ئەم ڕەگەزە بەکۆکردنەوەی لەگەڵ فریشتەکان و یەزدان جیهان پێك دەهێنن.

ئەگەر هەریەکێك بیروبۆچوونەکان و کارەکانی بەپێی فەرمایشتەکانی یاسای سروشتی ڕێکبخات. ئاشتی سەرانسەری گەردوون دادەگرێت. یاسای سروشتی دانراوە یا شەرعییەتی پێدراوە بۆ ئەوەی ڕژێم لە چنگ تێکدەر و خراپەکاران بپارێزێت. ئەوانەی بە چاندنی بەرەڵاّیی و پاپەندنەبوونیان بە یاساوە و نارێکیان، پەیمانی گشتی لە نێو کۆمەڵگا دەدڕێنن.



زۆرجار هەڵوێستی توندی باوك و هەبوونی سەرباز و چەك و سیستەمی خاوەن کۆیلە بەسەر کۆیلەکانی... هتد گشتیان بابەتی زەروورین بۆ ڕێگرتن لە لاساران، و خراپەکاران و سەپاندی یاساو ڕژێم (بەراوردی بکە لەگەڵ بیرۆکەی ئاشتی یۆنانی).

جارێکی تر قەشە ئۆگۆستین گوتەکانی قەشە (پۆلس)مان بەیاد دەهێنێتەوە ئەوەی دەڵێت: هەموو دەسەلاّتێك لە یەزدانەوەیە و هەر کەسێك دژی بوەستێت ئەوە دژی ڕژێم و یاسای یەزدان دەوەستێت. بۆ نموونە: میر (الامیر) شاڵیاری (وزیر) یەزدانە، بۆیە گوێڕایەڵیکردن بۆ میر زەرووریيە. بەدەستەواژییەکی تر. یەزدان سەرچاوەی هەموو دەسەلاّتێکە- ئەم وشانە ئۆگۆستین چەندین جارەیان دەکاتەوە- یەزدان دەسەلاّت دەبەخشێت بە چاکەکاران و خراپەکاران هەروەکو چۆن باران بەسەر چاکەکار و خراپەکاردا دێتەخوار. بۆیە گوێڕایەڵیکردنیان پێویستە وەك گوێڕایەڵیکردن بۆ میرە چاکەکان و ئاکار باشەکان. یاسای کاتی (زەمەنی) ئامرازێکی زەروورییە بۆ بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایی کردنی (حوکمکردنی) خێزان و شار. هەرچەندە ئەو بێ توانایە لە بەخشینی ئاشتی و ئاکارباشی (فەزیلەت) بەخەڵك. بەڵگەش لەسەر کەموکوڕییەکەی ڕۆمای ئەوکاتەیەو ئەو بارە نالەبارەی کە تیایدا بوو لە کاتێکدا کە ئەو یاسا و شەرائیعی بە جیهان دەبەخشی.





یاسای کاتی سەرچاوە لە یاسای سروشتی- هەمیشەییەوە وەردەگرێت یا لە ئەمەوە دەردەچێت. بۆیە بەم پێیە دەبێت ئامانجی سەرەکی ئەو سەروەری و دادوەری (عەدالەت) بێت. نەك بۆ خزمەتکردنی فەرمانڕەوا (حاکم) و لە پێناو پشتگیریکردن بێت لە هێز و ستەم. ئەو دەبێت هەڵستێت بە خزمەتکردنی کۆمەڵگاو دابینکردنی سیستەم و ڕژێم تیایدا، بۆیە گوێڕایەڵیکردنمان بۆی پێویستە هەروەك چۆن لەمەوبەر باسکرا. هەروەها بەم پێیەش دەبێت ئەوا (مەبەست یاسای کاتییە) بوەستێت بەدابینکردنی ئامانجە ڕامیاری و کۆمەڵگاییەکان، نەوەك کاروباری وەها بگرێتە خۆی کە لێپرسینەوەی دەربارەیان لە تایبەتمەندییەکانی یەزدانە. بۆ نموونە: ئەرکی ئەو نییە کە سزا لەسەر کارێك بدات کە زیان بە ئەوانی تر و بە کۆمەڵگا ناگەیەنێت. بۆیە چوارچێوەکەی (هی یاسای کاتی) دیاریکراوە، زۆر تەسکتریشە بە بەراورد لەگەڵ چێوەی یاسای هەمیشەیی کە هەڵکەندراوە لە نەفسدا.

پوختەی ئەوەی گوتمان، یاسای دانراو (وضعي) یا کاتی بەگۆڕانی کات و بارودۆخەکان دەگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە دەگۆڕێت (یا گۆڕانکارییەکانی) هەر سەرچاوەگرە لە بنەماو ڕێسایەك کە هەرگیز ناگۆڕێت.

جەنگ: ئامانجی هەموو کۆمەڵگایەك ئاشتییە، ئەمەش لەگەڵ واقیعدا یەکناگرێتەوە، چونکە جەنگی تیادا زۆرە. ئۆگۆستین



دەڵێت جەنگ تەنها لەرەواڵەتدا دژە لەگەڵ ئارەزووی کۆمەڵگاکان کە بریتییە لە بەدەستهێنانی ئاشتی. جەنگی ئەوانیش هەر بۆ جێبەجێکردنی ئەو حەزەیە کە ئاشتییە، بە دەستهێنان و جێبەجێکردنێکی وا کە حەزو ویستی هەمووان بۆ ئاشتی تێربکات و ئاشتێکی بەردەوام و راستەقینە بێت، وەك ئاشتێك کە بەر قەرارنە بێت و تەنها ئارامییەکی کاتی بێت. بەم شێوەیە جەنگ و شەڕو شۆڕی نێوان کۆمەڵگاکان ئامانجەکەی، لەکۆتایی ڕێگادا، لە پێناوی شەڕکردن نییە بۆ خۆی بەڵکو لە پێناو ئاشتییەکی گونجاو لەگەڵ ویستەکانیان. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەو کۆمەڵ خاڵە بکەین کە لەژێر چەمکی یا بیرۆکەی، شەڕەجەنگ، پلەبەند دەکرێن، کە بریتین لە:

١- **بەرگریکردن لەشەڕ:** یاشەرعییەتی شەڕ: کاتێك کە مەبەست لە(جەنگ) شەڕدا گەیشتنە بە ئاشتی، و هەر لە پێناو ئەمەش کە هانای بۆ دەبرێت. ئنجیل دێت و فەرمایشتەکانی بانگەشتە بۆ بەرگری نەکردن لەشەڕدا دەکات. هەروەها چۆنیەتی مامەڵە کردن و وەلاَمدانەوەی چاکمان فێردەکات لە ئاست خراپەکاریدا. بەم جۆرە چۆن کۆمەڵگایەك دەتوانێت شەڕبکات؟ بە دەستەواژەیەکی تر. کەی شەڕ شەرعییەت وەردەگرێت؟ و ئایا دەشێ تۆڵەکردنەوە لە ئاست خراپەکاردا هەبێت؟ لە ناو کۆمەڵگادا یاخود دەبێ سزاکان لەسەر تاوانباران و لاسارەکان جێبەجێبکرێت؟ بۆ ئەوەی یاساکان بسەپێنرێن





و بەردەوامییەت وەربگرن و سیستەم پارێزراوبێت بە شێوەیەکی گونجاو، هیچ رێگایەك نییە جگە لە سزادان و پاداداشت دانەوە.

هەروەها کۆمەڵگایەك کە دەست درێژی کراوەتە سەر، ئەرك و مافی خۆیەتی کە بەرگری لە خۆی بکات و شەڕ لە دژی شەڕانگێزان بکات.

دەنا لە حاڵەتی پێچەوانەدا، ئەمە دەبێتە هۆی پایە بەرزبوونە وەیان زێدەڕۆی کردن یان لە ستەم و لاسارییەکەیان. بەم پێیەش دادپەروەران و چاکەکاران ئازار دەچێژن لە چنگ ئەو دۆخە شڵەژازوەی کە تیایدا کەوتوون. بۆیە ئەگەر ئەوانیش پەنایان بۆ شەڕ هێناو کەوتنە شەڕکردن ئەوە لە خۆشوویستن شەڕ و تۆڵە سەندنەوە نییە، بەڵکو بەرگری کردنە لە ویست و ئارەزووەکانیان بۆ ئاشتی و پاراستنی مافەکانیانە. بەلاّم لەگەڵ ئەمەی کە باسیشمانکرد ئۆگۆستین هەر جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە کە پێویستە شەڕەکان -ئەگەر شەرعییەتیان پێدا- جۆرێکی مرۆڤانەیان هەبێت ئا لێرەدا پیاخشانێك دەربارەی فەرمایشتە رۆحییەکان دەکات لەسەر پرۆسەیەکی ئازاربەخشی(مەبەستی جەنگە) کە پێویستە حەسانەوەیەکی بەردەوامی لە دوابێت. کە بریتییە لە ئاشتییەکی بەردوام و راستەقینە. کەوابێ ئەی ئێستا ئاشتی چییە؟



**٢- ئاشتی:** بریتییە لە سستەمێك. کە کار دەکات بۆ ئەوەی جۆرە گونجانێك لەنێوان بەشەکان و ویستەکاندا بەدی بهێنێت بۆ بانگەشتەکردن و بەدەستهێنانی ئاشتی، و لەسەر هەر یەکێکیان پێویستە کە لە شوێنگەی خۆیان بن، بۆ ئەوەی ئەرکەکانیان بەباشترین شێوە بەجێ بهێنن. ئەم نموونەیەش تێبینی دەکەین لە نێو ئەندامێتی لاشە، و لە نێو نەفس، لە نێو شاردا(کۆمەڵگا) ئاشتی، لێرە بێت یا لەوێ: بریتییە لە سەروەری سستەم و رێك و پێکی و هاسەنگی، لە نێوان هەموو ئەندامانی لاشە، وەکو ئەوەی لە نێوان ئەندامانی خێزاندا بەدی دەکرێت لە پەیوەستی و پابەندبوون بە سەرۆکی خێزانەکان لە نێو خانە نشینەکەیاندا بۆیە ئاشتی بۆتە ئامانجی کۆمەڵگا و لەسەر رێکخستن و پلەداری دامەزراوە.

**٣- تاعەتگەری:** یەکێك لە ئەرکەکانی سەرباز گوێرایەڵی کردنە و جێبەجێکردنی ئەو بانگەوازییە کە تیایدا کوشتنی لێ داوا دەکرێت. لێرەدا ئەو تاوانبارە بکوژ نییە، واتا ئەنجامدەری تاوانێك نییە کە کوشتنی مرۆڤێکە یەزدان خولقاندویەتی و ئەمیش دێت و ژیانی لێ دەسەێنتەوە، خۆ ئەگەر سەربازەکە باوەڕی بە دادوەری ئەو جەنگەش نەبێت کە تیایدا بەشداری دەکات، هەر پێویستە کە شەڕ بکات و گوێ رایەڵ بێت. و بۆی نییە قەتات و قەت سەرپێچی فەرمانەکان بکات و دەنا دەکەوێتە





نێو تاوانی یاخی بوونەوە. و بە هیچ شێوەیەك تاوانکاری لە نێو شەڕدا ناکەوێتە سەر ئەستۆی سەربازەوە، بەڵکو دەکەوێتە ئەستۆی ئەو حاکمەی کە ڕێگای بۆ سەرهەڵدانی ساداوە.

**٤- هێز لە دژی هەرتەقەکان:** ئۆگۆستین بانگەشەی بۆ بەکارهێنانی هێزکردووە لە دژی هەرتەقە کارەکان و ئەوانەی لە ڕێباز و ڕێگای ڕاستی لادەدەن و جیادەبنەوە. و پێی وابوو کە چەوساندنەوەی ئەمانە کارێکی ڕێگا پێدراوە، چونکە بریتییە لە چەوسانەوەی خراپە لەلایەن چاکەوە. ڕەنگبێ لێرەدا واتە لەم هەڵوێستەدا ڕەتکردنەوەی نموونە بەرزەکانی شاری ئاسمانی بەدی بکەین کە خۆی خستبووینە پاڵیەوە و هەوڵدانێك بێت بۆ دروستکردنی گونجانێك لە نێوان ئەو و لە نێوان واقیعدا، یاخود لە نێوان شاری ئاسمانی و شاری زەمینیدا.

وە **خاوەنداریەتی:** لە چەرخی ناوەڕاستدا گرفتی خاوەنداریەتی شوێنگەیێکی بەرزی گرت لەلای باوکانی کڵێسادا. و ئەو تاوتوێکردنە گەرمەی کە دەربارەی رووی دەدا زۆر لە هەڵوێستەکانی لە ئۆگستینییەوە وەردەگرت. لەم دواییەدا، هەندێك دەیان گوت کە شیوعی بووە. هەندێکی تریش دەیان گۆت کە" شیوعییەکی تیۆکراتی" بووە جگە لە مانەش دەیان گۆت کە خاوەنداریەتی لە روانگەی ئەودا لەسەر یاسای وەزعی مەدەنی دامەزراوە نەك لەسەر یاسای سروشتی هەر بۆیە جەخت تەنها لەسەر دەسەلاتی مەدەنی



دەکات هەرچی یەك بێت، دەتواندرێ بۆ زێتر تێگەیشتن وحاڵی بوون لە تیۆرەکانی سەبارەت بە خاوەنداریەتی بیان گەڕێتەوە بۆ ئەو بارەی کە تیایدا بووە و لە نێو چوار چێوە مێژووی و کۆمەڵگاییەکەی داینێنەوە.

واتە بەگەڕاندنەوەی بۆ ئەو ناوەندە ئایینی و ژینگەییەی کە تیایدا هۆنراوەتەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە تیۆرەکانی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری تراسی ئایینی، لەلایەکی ترەوە کەوتۆتەوە ژێر کاریگەری ئەو زانیارییانەی کە دەربارەی ئاراستەی هزرە سیاسییە یۆنانییەکانەوە هەبوو.

کۆمەڵە گەلێك لەباوکمان داوای لابردن و نەهێشتنی خاوەنداریەتی لەلای تاکە کەس دەکەن بەپشتبەستن بە ئینجیل و، بە پەیامبەر، ومەسیحییە پێشینەکان (سەرەتاییەکان). بەلاّم بە بەڵگەهێنانەوە لە ئینجیلەوە جارێکی تر رایەکانیان رەتدەکرایەوە، وەکو: کاری بەشێك لە پەیامبەران لەوانە ئیبراهیم و ئیحساق و یعقوب (درودیان لەسەر بێت) کە خاوەنییەتی تاکەکەسی (الملکیە الفردیە) زۆر و گەورەیان هەبووە "هەروەها ئەم رایە لە روانگەی بانگەوازی کردن بۆ شیوعییەتیش رەت دەکاتەوە چونکە ئەوانەی بۆ ئەو دەڵێن شۆڕش بەرپادەکەن لە دژی یاسا و سیستەم و حوکمڕانەکان و لە دژی شار بۆیە شایانی سزادانی.





ئەمە وادەگەیەنێت کە ئۆگۆستین وەك ئەوەی پێشتر بینیمان لە هەمان بنەما لاهوتی و عەقائیدەکانەوە (ئایینزا) سەرچاوە دەگرێت و دەردەچێت و ئەمە لە گشت بەشەکانی بەرهەمە فیکرییەکانییەوە دیارە.

ئۆگۆستین بیلاجەت و شیوعییەتی رەتکردۆتەوە، و پێیوانییە کە هەموو خاوەنیەتییەك شتێکی خراپ یا کفر بێت، یا پێچەوانەی فەرمایشتەکانی ئینجیل بێت. و باوەڕی بە شەرعییەتی تەواوی خاوەنداریەتی تایبەتی مرۆڤ هەیە، چونکە گرفتەکە لە خاوەنداریەتی نییە، بەڵکو لە شێوازی ئەو خاوەنداریتەیە. بە شێوەیەکی تر ئەوانەی ماڵ و سامان کۆدەکەنەوە و خێر و نیعمەتەکان دەشارنەوە بە هۆی چاو برسییەتی و تەماحکارییەوە نەزانن بەوەی کە یەزدان خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، ورزق بە دەستی ئەوە، و خاوەنداریەتی گشتی شتەکان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. و ئۆگۆستین بانگەوازی بۆ نەهێشتنی خاوەنداریەتی نەکردووە، بەڵکو جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە گرنگی خاوەندارێتی نییە، بەڵکو شێوازی بەکاربردنییەتی. واتە کاتێك ئێمە هەڵدەستین بە بەکارهێنانی بەروبوومێك یا سەروەت و سامانێك یا هەر شتێك کە هەمانە بە شێوەیەکی نەشیاو نەگونجاو ئەمە خاوەندایەتیمان بۆی خراپ و شەڕدارە، کاتێك خاوەنداریەتیش سود و قازانج ناگەیەنێ،



بەڵکو شەڕی لێ دەکەوێتەوە ئەمە مانایی وایە (کە چاکترە) خاوەنداری نین و لە خاوەنداریەتی ئێمەدا نییە.

لەسەر ئەم ئەرزەدا، وەك ئەوەی ئۆگۆستین دەڵێت. دابەشکردنەوەی خاوەنداریەتی بەپێی بە چاکی بەکاربردنی بۆ ئەوەی مەشروعییەتی پێ بدەین، کارێکی نامۆ و نەکراوە. بۆیە باشتروایە کە گشت شتەکانی لەسەر حاڵەتی پێشووی خۆیان بمێننەوە. و ئەم دادپەروەرییە رەهایە بۆ شاری یەزدانی جێ بهێڵدرێت کە تیایدا دابەشکردن بەم پێیە دەبێت، لەوێدا دادپەروەرەکان خاوەنی هەموو ئەوانەن (شتومەك) کە دەزانین چۆن بەکاریان دەهێنن، و ئەوەی دەزانین وەك ئەوەی دەبێت بەکاری بهێنن بەم شێوەیە بەکاریدەهێنن. بەکورتی، رزقەکان بەدەست یەزدانە ، و ئەو دروستکار و خاوەنیانە. ئۆگۆستین رێگا بە خاوەنداریەتی دەدات بە شێوازە مەشروعەکانی.

وەك: کڕین و ئاڵوگۆڕکردن، و بەخشین، و میراتگرتن. بەڵام بە دەستهێنانی (شت و مەك) ئەرزاق بە شێوازی تر و کە لە پێوستی خەڵکانێکی ترە یان بە دزین یابە زەوتکردن دەبێت. ئەم جۆرەش بۆمان دەردەکەوێت کە ئۆگۆستین وەك زانایییەکی تیۆری (نزری) هەڵنەستاوە بە دراسەکردن و لێکۆلینەوە لە سیستەمی خاوەنداریەتی (الملکە)، چونکە مەبەستی نەبووە کە گرفتێکی کۆمەلایەتی یا ئابووری چارەسەر بکات. بەڵکو ئەو بەپێی ئەرکە ئاینییەکەی هەموو بابەتەکەی لەگۆشەیەکی سرف ئاینییەوە





وەرگرت، چونکە ئەوە تەنها گۆشەیەکە کە بە لایەوە گرنگە. بۆیە ئێمە رزگاربوونی نەفس بەئامانجی بیرۆکەکانی دەبینن، لێرەدا دەربارەی خاوەنداریەتی. هەر لەبەر ئەمەشە کە جەختی لەسەر ئەمەکردۆتەوە کە یەزدان خاوەنی هەمووشتێکە، و هەموو شتێك دەبەخشێت وەك ئەوەی کە خۆی دەیەوێت بەبێ لێ پرسینەوە و بۆ هەرکێ یەك کە خۆی دەستنیشانی دەکات لە مرۆڤەکان.

خاوەنداریەتی تایبەتی، لەدیدگای ئەو، مافێکی سروشتییە. بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە مافێکی زەروری بێت. ئەو(واتە خاوەنداریەتی) بەشێکە لە مافەکانی مرۆڤایەتی. بەم جۆرەش لە چوارچێوەی پاراستنی سیستەم و عەدالەت، خاوەنداریەتی دەبێت بکەوێتە ژێر کاریگەری وستی دەوڵەت کە توانایی سنووردارکردن و رەتکردنەوەی هەیە.

لە جیهانی ئەوبەردا خاوەنداریەتی تایبەتی بوونی نییە. بەکورتی، خاوەنداریەتی باشە، خاوەنداریەتی کارێکی چاکە، بەلاّم ئەمە سەروەت و سەرمایەزۆرەکانە کە تەماحکاری لەلای هەژار و نەدارەکان بە جۆش دەهێنێت، و لەلای خاوەن ماڵ و سامانەکانیش



لەخۆبایی بوون و خۆ بەزڵ زانی* دروست دەکات. بۆیە کەواتە باشتر و کاملّتر وایە کە واز بهێندرێت و نموونە لە هەژاری قبولّ کراو ویستراوی مەسیح (دوورودی لەسەربێت) وەربگیرێت و بکرێتە پێشەوا، یاخود بەلایەنی کەمی، هەولّی خۆرزگارکردن بدرێت لە چنگ فریودان و تەرخاندنی پێویستە بە چاکترین و جوانترین شێوە بەکاربهێنرێت لە پێناو یەزدان و بەرژەوەندی ئەوانی تر(تاکەکانی کۆمەڵگا). کەواتە ئۆگۆستین نەبۆ شیوعییەت و نە بۆ دەسەلاّتی یەکەم و بالاّی دەوڵەت (الدولانیە) هیچی نەوتوە.

ئەگەر ئێمە بەراوردی قەشە ئۆگۆستین بە قەشە تۆما بکەین ئەوە جگە لە کات بەفیڕۆدان هیچی تر ناکەین. ئەو قەشە تۆماسەی کە ئەم بابەتانەی گرتە خۆی و دەوڵەمەندتری کردن بە کەڵك وەرگرتن لە و هزر و بیرۆکانەی لە لای ئەرستۆ و فیکری ئیسلامی هەبوون. تۆماس جۆرە گونجانێکی لە نێوان ئەمانە و عەقلاّنییەتی سیاسی و ئابووری لەسەدەی سێزدەهەم کە ئاشکرایە لە مەسیحییەتدا بەدیکرد. و هەڵسا بە ئیزافەکردنی زانیارییەکانی خۆی دەربارەی ئەو بەرەوپێش چوون و وەرچەرخانەی کە لە فیکری سیاسی و ئابووری سەدەکەی خۆیدا روویان دەدا.

---

*یاخود"الصلافە" گەورەترین مەترسییە کە لە دەوڵەمەند بوون چاوەڕێ دەکرێت. لە ئینجیل باس لە قەرسی بوونی دەوڵـــەمەند دەکات وەك چوونی وشتر لە شەقی دەزو پەراوێز)





لەکۆتاییدا. شتێك دێتە یادمان ئەویش ئەم سیفەتە ناشیرنەیە کە بریتییە لە دەست بە پوڵ و پارەوەرگرتن یاخود(رەزیلّی) و (سەفیلی)شی پیّ دەلێن: ئەم کە پەیوەندارە بە خاوەنداریەتی.

رەزیلی(سەفیلی) لێرەدا واتا ئەو ئامادە باشی یەیە لەنێو نەفس کە بەشداریکردن لە خاوەنداریەتی یان دابەشکردنی رەتدەکاتەوە. بەڵکو ئەو هەوڵی کۆکردنەوە تەنها بۆ خودی خۆی دەدات، و دەست بەسەر شتەکان دادەگرێت وخاوەندارییەتیان دەداتە پاڵ خۆی (خۆی بەخاوەنیان دەزانێت) وەك ئەوەی کە تەنها بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی تاکە کەسێك (کە بە خۆی دەزانێت) تەرخانکرابن. (جلسون ـ دەروازە.....ـ ص١٤٤). لێرەدا هەوڵدان بۆ گەیشتن بەبیرە زەروری و هەمیشەیەکان دەربارەی یەزدانەوە (لەلایەن هەر مرۆڤێکەوە کە دەیەوێت بگات بە راستی شتەکان و خاوەنیانی ئەم راستییە بێت) ناچێتە قالّبی رەزیلییەوە، هەڵبەتە بیرۆکە ئیلاهییەکان (خواوەندییەکان) گشتگیرییەکی جیهانیان هەیە و هاوبەشن لە نێوان هەموو ئەقڵەکاندا.

بەم جۆرە لە دیدگای ئەو(ئوگۆستین) ئەم مۆرکە رۆحانی یا ئەو تێروانینە ئەخلاقییە بۆ رەزیلی پەیوەستە بەو خۆ بەگەورە زانینە کە لە کاتی تاوان و گوناهکردنی یەکەمەوە یاخود رەسەنەوە سەری هەڵدا: (هەڵە و گوناهکردنی رەسەنی ئادەم لە کاتی هەڵبژاردن دا، ئەو هەڵسا بە هەڵبژاردنی خاوەنداریەتی



شتەکان و رەزیلییەتی لە بری هەڵبژاردنی گوێڕایەڵی بۆ خێری بالاّ (کە یەزدانە).

جارێکی تر، بابەتەکە لە روانگەیەکی ئایینییەوە وەرگیراوە. کە لە رووی جیهانی ئەو دیو یاخود ژیانی کۆتاییەوە سەیریکراوە نەوەك وەك گرفتێکی کۆمەلاّیەتی یا لەسەر ئاستێکی سەرتاپا تیۆری.

## ز ـ کارکردن:

کوری قەشە مۆنیکا ژیانی کۆمەلاّیەتی، و هەموو ئەو چالاکییە کارەکی یانە (عەمەلی) بەگشت لایەن و مەبەستەکانیانەوە، دەخاتە ژێر مارەسەکردنی تێرامینەوە(تەئەمل). چونکە پێیوایە کە لە تێرامین (تەئەمل)ەوە نرخ بە دەستدەهێنرێ و هەیە، و ئەو لە ترۆپێکدایە، و لە ئاستێکی نزمتر کارکردن و ژیانی کۆمەلاّیەتی هەیە.

ئەم دووانەی یە بەپشت بەستن بە جیاکردنەوە لە نێوان حکمەت و زانستدا راوەستاوە، چونکە تێڕامین دەدرێتە هی یەکەم و کارکردنیش بۆ زانست دەگەرێنرێتەوە. پێویستە هەر وەرگرتنێك یا خواستنێکی چەمکی کارکردنی ئۆگۆستینی ئەو چوارچێوە و سیاقی مێژوویی و کۆمەڵگەیی و رۆشنبیری(فەرهەنگی) بە رەچاوبگرێت.





**٤- سەرچاوە سیاسییەکانی و مەرجەعەکەی:**

هەندێك لە تۆژەکان وادەبینن کە چەمکە سیاسییەکان لەلایەن ئۆگۆستین، هەرچەندە بەش بەش کراو و پەرش و بلاوبن لێرەو لەوێ، عەقیدەیەك پێك دەهێنن، کە وەك پەیمانێك مامەڵەی لەگەڵ دەکرا لە ئەوروپا. بەدرێژایی چەندین سەدە ئەم عەقیدەیە لەژێر کاریگەری چەندین سەرچاوە دروست بوو لەوانە:

أ= بیرۆکەی کێ بەرکی کە لەلایەن ئۆگۆستین هەیە و واپێدەچێت کەلە مانەویەتەوە وەربگرێت ئێمە بینیمان کە ئۆگۆستین چۆن پێچەوانەکاری (المعاکسة) لە نێوان شاری خودا و شاری شەیتاندا کرد، کە ئەمە بیرۆکەیەکی مانەوەییە باس لە هەبوونی دوو هێزی ململانێ کاردەکات لە جیهاندا، (ئەم بیرۆکەیە پاش دەستکاریکردن و راستکردنەوەی ئۆگۆستین لە مانەویەتەوە وەریگرت.

وبە هیچ شێوەیەك واز لە بیرۆکەی کێ بەرکێ کردن و جەنگ لە نێوان بنەما دژبەیەکان ناهێنێت. شتێکی لەم بابەتەش بەدی دەکەین لە کاتی باسکردنی یا(رەخنەگرتنی) هەڵسەنگاندنی بۆ مێژووی رۆمانی کە ئاماژە دەکات بەوەی کە مێژووی ململانێیەکی پاڵەوانانەیە لە نێوان رۆحی (هێنری) خێر و رۆحی شەردا. لە کۆتاییدا لەتیۆرەکەی دەربارەی هۆکاری جەنگدا دەڵێت: کە جەنگەکانی رۆما بە سروشتی شەیتانەکان بووە، ئەمەش تیۆرێکی مانەوەی ترە.



**ب-** سەرچاوە ئەفلاتۆنییە سیاسییەکان: ئاشکرایە کە بیرۆکەی یەزدان تاکە، سەرچاوەی هەموو وبونێك و هەموو دەسەلاتێکە، بیرۆکەیەکی ئەفلاتونییە. بەهەمان شێوەش ئەو تیۆرەی کە ئەقڵ بە بنەمای دادوەری و یاسا دادەنێت: لە هاوشێوەی ئەمانیش تیۆری چاودێری یەزدانی کە رێرەوی رووداوەکان رێکدەخات، ئەمانە بیرۆکەی ئەفلاتوونین کە ئۆگۆستین لە رێگای ئەفلۆتینەوە وەری گرتوون.

ج- سەرچاوە سیاسییە شیشرۆنییەکان: بینیمان کە کاریگەری ئۆگۆستین بە شیشرۆنە وە چەند گەورە بوو چ لە بواری روانبێژی، یا لە خۆشویستنی فەلسەفەت و لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکان و باس و تاو تووێ کردنەکان جارێکی تر ئەم کارتێکردنە بەروونی لە هزری سیاسی ئۆگۆستینەوە دەبینن و دەرك دەکەین، بەتایبەتیش لە پێناسەکردنی دادوەری (العدالة) هەروەها لە پێناسەکردنی یاسا و سروشتی و سەرچاوە و خەسڵەتەکانی و ئەرکەکانی قەزا... ئۆگۆستین لە هەموو ئەم باسانەدا ئاماژە بە راو پێناسەکانی شیشرۆن دەدات یاخود تێکستێکی ئەو(بە نمونە) دەهێنێتەوە. یا تەنها بە شیکردنەوەی تێکستە شیشرۆنییەکە دەوەستێت لە هەندێ جاردا.

ئۆگۆستین سوودی لەو سەرچاوە مێژوویی و ئەدەبییە جۆراوجۆرانە وەرگرتووە کە لە نەمان و تێکشانی رۆمایان کۆڵیوەتەوە، و بە دوایی





هۆکارەکانیدا گەراون (لە پێنج وتارە سەرەتاییەکانی"شاری خۆدا"دا هەیە). سەرچاوە کۆتاییەکانی ئەو (ئۆگۆستین) بریتی بوون لەو کتێب و فەرمایشتە پیرۆزانەی کە تارادەی کامڵ بوون پێیان گەیشت و لێیان حاڵی بوو. ئەوانەی کە تیایاندا "گشت بنچینەکانی لاهوتە دۆگماتییەکەی، و ئەخلاق و سۆفیگەرییەکەی" دۆزییەوە. هەروەها ئەو شارەزاییەکی زۆری دەربارەی بەرهەمی باوەکەکان هەبوو، ئەو زۆر بەچاکی"ترتولیان"و "ئیمبرواز" و ئەوانی تری خوێندبۆوە. بە شێوەیەکی تایبەتی کەڵکی لەم دووانە وەرگرت و زۆربەی هەڵوێست سیاسی و عەقائدییەکانیانی گرتبووە خۆ.

## ٢- بیروباوەڕە سیاسی یەکەی، دیدێکی گشتگیی:

یەزدان بنەمایە و ترۆپکی لە دەوڵەت: خاوەنی دەسەڵاتە.

رێکخەری ئیمپراتۆریەتەکانە و سروشدەری یاساکانە، سەرچاوەی دادوەرییە، خۆشەویستییەکەی کۆڵەگەی وڵاتەو ناوبژیوانی دادوەرە لە جەنگدا. بۆیە دەبێت حاکم و شەرعگێڕان و دادوەر(قازی) و سەرباز خۆیان بە فەرمانبەری ئەو بزانن، وادابنێن کە ئەوان ویستی ئەو جێبەجێ دەکەن و جێگانشینی رێگا پێدراون لەلایەنییەوە و دەسەڵاتی ئەوان لە دەسەڵاتی ئەوەوە سەرچاوەی گرتووە و پێیان بە خشراوە. بۆیە پێویستە لەسەریان کە خۆیان بەزل نەزانن و کەواتە دەبێت ئەوان فیز لێدەرنەبن، و ئەرکەکانیان بەخراپی بەکارنەهێنن



(مەبەستی بۆ بەرژەوەندییە تاکییەکانی خۆیان)، و دوورە پەرێزین یاخۆ بە دوور راگربن لەستەم پێوستە لەسەر حاکم کە خۆی لە تەماحکاری بەدووربگرێت و بە لاوەی بنبێت، خۆی لە شەرەکانی جەنگی" غەزو" و فتوحاتەکان بپارێزێت  پێیان هەڵنەستێت. بۆ ئەوەی سیستەمێك نەشێوێنێت کە بەرزترین تەگبیرکار دایناوە. ئەرکی حاکمە کە یاسایی دادپەروەرانە دابڕژێت و فەرمان بە دانانی بکات ئەگینا ئەو دژایەتی لەگەڵ یەزدان و بەسۆزی یەکەیدا (رحمة) دەکات. هەردەم دادوەر(قازی) دەبێت لە سزاکاندا زۆر توند رەونەبێت، و خۆلادەربێت بە پێی توانا لە ئازاردانە قورسەکان: سزای لەسەردان (الاعدام)، وەك رێزگرتنێکی ئەو یەزدانەی لە سەروەری ژیانە و رێزلێنانێك بۆ ئەو مرۆڤەی کە لەسەر ئەرزدا جێگیری یەزدانە.

ئەرکی سەرباز ئەمەیە کە لە ئاست زامدارەکاندا میهرەبان بێت. ولە ئاست دیلەکاندا چاکەکاربێت بەزەییی بێتەوە بەو(مەدەنی) یانەی شەرکەرنین. و هەڵنەستێت بە لە ناوبردنی دوژمنان و تێکڕانی و کاوڵ کردنی زەوی و زاریان بەبی ئەوەی پێویست بکات، چونکە سزادان دەبێت لە ژێر بەزەیی و دەستی یەزدان دا بمێنێتەوە کە لە لای ئەو دادوەری و بەزەیی بەیەك دەگەن.

میرنشینی یەزدان لە ناخەکاندایە و لە ویژدان و دەروونییە و لە دڵی ژیانی مەدەنییە کە دەیهێنێتە کایەوەو دەیجولێنێت و بە





ڕێرەوی دەبات و ئەگەر حاکم و یاسادانەر و هاوولاّتی، فەرمانەکانی یەزدانیان جێبەجێکرد ئەوە شار دەژییێتەوە وگەشەدەکات و بۆ گوێڕایەڵی کردن لەو فەرمانانە ئەوە پێویستی بە نیعمەتێك هەیە.

سیاسەتی ژیرانە و بەرهەمدار ئەوەیە کە ڕوو لە ئامانجە ڕۆحییەکان دەکات، لە کاتێکدا کە هەموو دەسەلاّتەکان لە یەزدانەوەن، بۆیە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو بەڕێ بکرێت بۆ گەیشتن پێی، سیاسەتێکی ئاوەهاش بوونی نییە مەگەر مەسیحی نەبێت گرنگ نییە ئەگەر پادشایەتی یا ئەرستۆکراسی یا خود کۆماری بێت. هیچ کامیان پەسندکراو نییە بەسەر ئەوی تردا، گرنگ ئەوەیە کە پابەندی یاسا(عەدلەت) بێت و دادوەری و ئاکار باشی بکرێت بە بنچینەی حوکم و دەوڵەت.

ئەوەی ئەفلاّتوون ئاماژەی پێکرد، بەڕای ئۆگۆستین، هەربە یۆتۆپیای مایەوەو هیچی لێ جێبەجێ نەکراوە، و دەوڵەتە بت پەرستەکان هیچ جۆرە ئاکار باشێك وەکو حکمەت هەروەها دادوەری، و ئەقڵ، وگونجان و ڕێککەوتن نازانن و پەیڕەوناکەن، بۆچی؟! چونکە وشەی "یەزدان" هەڵگری ئاکار باشییە و دەیچێنێت لە نێو دڵەکان: هیچ کامێکیان نە حاکم و نە یاسادانەرو نە دادوەر(قازی) دەتوانن بە کارەکانیان هەڵسن بە چاکی مەگەر مەسیح بکە بە پێشەوا.



و خۆ نەویستی و دادوەری مەسیحی لە دڵیدا دانەنێت. لەوکاتەدا توندڕەوەی بێزەیی و هەڵسوکەوتی ئاژەڵ ئاسایی یانە(وەحشیەت)ی شەرەکان نامێنێت یا زۆرکەمتر دەبێتەوە، چونکە ئایینە(عەقیدەیە) کەوا لە خوڕەوشت و دڵەکان دەکات کە نەرمی بنوێنن و دەبێتە هۆی مامەڵە کردن لەگەڵ دوژمندا وەك برایەك.

ئەمەیە سیاسەتی ئۆگۆستینی: لە ئەوپەڕی باوەڕداریەتی دایە، ومەسیحییەت بە ئایینی دڵ دادەنێت و بێ هاوتای دەزانێت. و جەخت لەسەر ئاکارباشییە مەسیحییەکان دەکاتەوە وەکو: خاوێنی و خۆنەویستی و برایەتی کە بە بەردی بناغەی دەوڵەتی دادەنێت سەبارەت بە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کڵێسی ئەوە جۆرێك لەو پەیوەندییەمان بینی لە کاتی بەراوردکردن لەنێوان دوو شارەکەدا:

دەوڵەتی مەسیحی واتە جیانەکردنەوە لە نێوان دەوڵەت و ئایین، بەڵکو بانگەشتەش دەکات بۆ یەکبوونیان لە ڕێگای جێبەجێکردنی کڵێسا بۆ یاساکانی دەوڵەت و بەپێچەوانەوەش واتە دەوڵەت دان بە ئەولەویەتی ڕۆحی لە سەرووی کاتی(زەمەنی) یەوە بنێت، چونکە سەرکەوتن تەنها بۆ ئەخلاّقییە. ئەم یەکبوونەش هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی تەنها بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتە، چونکە دەوڵەت لەلایەنی ڕۆحییەوە یەکگرتووی و چالاکی و بە پیتی وەدەست دەهێنێن، و لەلایەکی تریشەوە کڵێسا یاسادانەر (المشرع) یا حاکم مرۆڤ دۆستانە تر دەکات، و هەڵی ستەمکردن کەمتردەکاتەوە، و هانی





ئاكارباشی دەدات. بینیمان كە كەڵكی لە ئەفلاتوون و شیشرۆن وەرگرتووە، هەروەها لە تیت ـ لیف Tite –live و فێرجیل و تیرۆرە ڕۆمانییەكان دەربارەی حوكم و سوڵتان. بەڵام ئەگەر ئەمانەش هەموو هەرس كردبێت ئەوا خۆشویستنی (المحبە- كاریتاس)ی لە جەرگەداناوە، ئەمەیە سەرچاوەی خۆشەویستی، و ڕۆناكی ئەقڵ، گڵپەی دڵ، ئاودێری گشت ئاكارباشییەكان.كەواتە لە سیاسەتەكەیدا ئەفلاتوونێكی مەسیحی بووە هەروەك ئەفلاتوونی بووە لە كۆمەڵێك شوێنگەی تر لە تراسەكەی ئەم عەقیدەیە لە ووردەكاری و قووڵ بوونەوە بێ بەش نییە، دانە نانی ئەم عەقیدەیە لە بەرهەمی تایبەتی مانای ئەمە ناگەیەنێت كە ڕێبازێكی بەهێز و وردەكار نییە. سیاسەتی ئۆگۆستین پانتایەكی فراوان دەگرێتەوەو گشت گرفتەكانی ژیان لە خۆوە دەگرێت، بریتییە لە تێروانینێك بۆ گەردوون و مرۆڤ كە جیانەكراوەیە لە ئایین، ئەخلاق، و نە لە سەرووی سروشت (الماورائیات) و ئێمە ناتوانین لە ڕۆژگاری ئیمرۆماندا سیاسەتی مەسیحی، یاخود هەتاكو سیاسەتی تیۆری بە شێوەیەكی گشتی بخوێنین بەبێ ئەوە بگەڕێینەوە بۆ راوبۆچوونەكانی قەشە ئۆگۆستین.



### ٦- كاریگەری بیروباوەڕی سیاسییەكەی:

كاریگەرییەكی بە هێزی هەبوو بەدرێژایی ژیانی، پاشان زێریش بوو. لاهوتییەكان بەخێزانەكانیانەوە قوتابی و شوێنكەوتووی ئەو بوون و بیرو نووسراوەكانیان تاوتووێ دەكرد و قبوڵیان دەكرد و یا ئەوەتا ڕەتیان دەكردەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەو هەمەوو كاتێك"ئەو مامۆستایەی بیری كاسۆلیكییە مایەوە كە دژایەتی ناكرێت" ئەو مامۆستایی ڕۆژئاوابوو، بەبێ هاوتا، هەتاكو هاتنی هزری ئەرستۆتالیسی لە سەردەستی عەرەبەكان. كاریگەری ئۆگۆستین بێگومان لە جۆری (كاریگەری) ئایینی بووە ئەوكلێسایەی كە تاكو ئێستا لە دەوڵەت جیا نەكرابێتەوە ئەوە بەبێ دوودڵی و بە شێوەیەكی ڕەسمی مەزهەبی ئەو جێبەجێ دەكات، بەڵكو بابە(لیۆن)ی سێزدەهەمین، لەسەدەی نۆزدەدا، وەكو ئۆگۆستین دەوڵەتی كرد بە بەرپرسیار یا بەرپرسیارییەتی گرنگی دان بەلایەنە ئەخلاقییەكان لە كومەڵگادا و بەرپاكردنی فەزیلەت و فەرمانی ئایینی دەخاتە سەر ئەستۆی ئەو(دەوڵەت).

بەكورتی، بیرۆكەكانی ئەو كاریگەرییەكی زۆری هەبوو لەسەر دروستبوونی دەوڵەتە ئەوروپییە نوێییەكان. ئاشكرایە كەوا كتێبی"شاری یەزدانی" پەسندترین كتێب بوو لەلایەن شارڵمان و كۆمەڵێك عەقائید و تیۆرگەلێكی زۆری لێ هەڵێنجا و وەكو





رێگانیشاندەرێکی بوو لە هەڵسوکەوتە کەسییەکانی هەروەها لە سیاسەتەکەی کە ڕەنگدانەوەیەکی دیاری هەبوو لەسەرانسەری دوارۆژی ئەوروپادا. دواتر ئەم تێڕامینە لە مێژووی مرۆڤایەتی، و ئەو تێڕوانینە گشتگیر و ئاسۆگەرییە سەبارەت بە ڕێڕەوی ڕووداوەکان، و پێشکەوتنی دەسەڵات، ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوەی خۆیان هەبوو لە چەرخی ناوەڕاستدا.

ئەم تێڕوانینانەی ئەو بەکارهات بۆ پشتگیریکردن لە باوەڕی (عەقیدەی) ئەو سیاسییانەی کە دەڵێت با دەسەڵات لەژێر دەستی کڵێسابێت، ئەمەیە کە ناونرابە ڕێچکەی ئۆگۆستینی سیاسی لە کۆتاییدا، ئۆگۆستینییەتی سیاسی عەقیدەیەکی لاواز تر و کەم دەرامەتترو لە ناوچو ترە لە بیری سیاسی ئۆگۆستینی کە ئەمەیان دەوڵەمەند ترو ئالۆزترە هەرچەندە ئەمە تەنها هەڵوێست نییە کە پشتگیری لە کڵێسا بکات لە دژی سوڵتانی فەرمانڕەوا(حاکم).

**٧- فەڵسەفەی مێژوو:** چۆن دەکرێت ئەم دووشارە دژبەیەکە، و هەمیشە ململانێ کارانە، کە بە بەردەوامی لەگەڵ یەکتری دا بژین ئەو لەتەك ئەودا؟. زانیمان کە"شاری یەزدانی لە وەڵامی ئەم پرسیارەیە. ئۆگۆستین لە سروشت مەشخەڵێکی بۆ خۆی وەرگرتووە: کە فێری سروشمان دەکات ـ کە فێرماندەکات کە لە سەرچاوەی خەلیقەتەوە سروش چۆن بووە و چۆنە و چییە ئەمە لەلایەك، دواتر لەلایەکی ترەوە ئاماژە بۆ کۆتایی ئەم خەلیقەتە



دەکات کە لە ئاخیری زەمان کۆتایی دێت. ئەمە وادەگەیەنێت کە سەرەتا کە لە ئادەمەوە دەستی پێکردووە، دواتر کە قابیینی بوو ئەمەی بە فعلی بنچینەی شاری زەمینی دانا. بەلاَم هابیل، تاکی شاری ئاسمانی، هیچ شارێکی لەسەر ئەم زەمینەدا دانەمەزراند و بۆشی دانەمەزرا(لەلایەن هیچ هێزێك یا هیچ کەسێك وەك ئەوەی کە ئیشارەتدانێك بێت بۆ ژیانی تاکەکان لەسەرئەم زەمینەدا) وبەردەوامی دا بەژیانی سەر ئەم زەمینەی تاکو دەربخات کە ئەو لەو جیهانەدا هەبووە و دەژی تائەوکاتەی کە کۆتایی هێنابە ژیانی سەر زەمینی و بەرێکەت بەرەو ژیانی نەمری. ئەمەیە ڕۆحی فەلسەفەی مێژوویی ئۆگۆستین.

فەلسەفەی مێژوویی ئۆگۆستین کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر فەلسەفەی مێژوودا، هەروەها وەك چۆن جلسۆن دەڵێت: بەڵکو لە وانەشە هەر لەسەر خودی مێژووش کاریگەری هەبووبێت. لەم فەلسەفەیەدا، دەبینین کە باوەڕ (ئیمان) سەرۆکە، و سروش ئەو مامۆستا و دۆزەرەوەیە کە سەرەتا و کۆتایی دۆزیوەتەوەو پەردەی لەسەر لابردوون ئەقڵیش جگە لە پاشکۆیەك کە بەدوای باوەڕ(ئیمان) دەکەوێت هیچی تر نییە.

دواتر ئەقڵ هەڵدەستێت بە ڕێکخستنێك لە نێوان ئەوەی کە بە فعلی ڕوو دەدات و ئەوەی دەزانرێ دەربارەی ڕوودانی ڕووداوێك لە ڕۆژێکدا (مەبەست لە داهاتوودا) و ئەوەی کە ڕووی داوە لە ڕۆژی





دروستكردن یا دروستبوون. بەم پێیە ئەقڵ لە چوار چێوەی ئەو سنوورەدا دەڕوات کە سروش بۆی نەخشاندووە(رەسم کردووە)، و دەبەسرێتەوە بە و خاڵەی کە خاڵی سەرەتایەو ئەو ئامانجەی کە ڕووداوەکان بۆی دەکەونە ڕێ و ڕووی تێدەکەن (کە خاڵی کۆتاییە) هەروەها بەو چاودێرییەی کە لەگەڵ ئەم بە ڕێکەوتنەدا ئامادەیە. مافی پێشبینی کردنی هەیە بۆ دوارۆژ(بە پشت بەستن بە رابردوو)، بەپێی ئەو وێنەیەی کە لە کتێبە، پیرۆزەکاندا سەبارەت بە رابردوو کێشراوە.

کەواتە وەك دەبینین مێژوو لە سایەی یەك یاسادا شیدەکاتەوە (ئەمە ئۆگۆستین). کە یاسایەکی ناسراو و دیاریکراوە، بەم شێوەیە هێڵێك بۆ یاسادەکێشێت، و کۆتایی و ئامانجیش بۆ دادەنێت. ئەمەیە فەلسەفەی مێژوو (لەلایەن ئۆگۆستین) کە لێرەدا تێڕوانینێکی بڕوادارنە و ئایینییە بۆ مرۆڤ، و مرۆڤ و مرۆڤناسی(علم الانسان ـ الانثروبولوجیا)، و سەرەتایی مرۆڤایەتی، و ڕێڕەوی ژیانی تا چارەنووسی . زۆرن ئەوانەی قەشە ئۆگۆستین بەیەکەمین زانای کڵێساکان دەژمێرن ئەوەی کە فەلسەفەی مێژووی دانابێت و گەیاندبێتی بە پلەی کامڵبوون، ئۆگۆستین وایدەبینی" کە جیهان هەمووی ـ هەر لە سەرەتایی بوونییەوە تاکو کۆتاییەکەی ـ تاکە ئامانجێکی هەیە کە ئەمیش دروستکردنی کۆمەڵگایەکی پیرۆزە کە لە پێناویدا هەموو شتێك



هەتاکو بهانیش دروستکراوە" ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکەین ئەمەیە کە جۆرەشیکردنەوەێك دەبەخشێت بە مێژووی جیهانی" شیکردنەوەیەك ـ کە لە ناوەرۆکدا ـ ئایینییە". لەوانەیە قەشە ئۆگۆستین بە فعلی دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژوویی نەبێت، ئەو ـ لەراستیدا ـ لاهوتییەکی مێژووییە، زێتر لەوەی فەیلەسووفێکی مێژوویی بێت.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەو -بێگومان- بە سەرچاوەیەك لەسەر چاوەکانی فەلسەفەی مێژوویی دەژمێردرێت یا هەر بە"بەخشکارو نێردەری ئەو فەلسەفەیە" دادەنرێت. کتێبەکەی بەناوی" شاری خودا" یەکێکە لە گەورەترین کتێبەکان کە ئینسانییەت ـ مرۆڤایەتی ـ بەدرێژایی چەندین چەرخ لێی دەکۆلێتەوە بۆ دۆزینەوەی ڕونکردنەوەیەك سەبارەت بە چارەنووس، پاڵنەرو هۆکارەمانی بوون، و ئامانج و هیوا بەرزەکان کە دەبێت پێیان بگەین لەگەڵ "لابریول" کۆتایی بە وەدەهێنین کە ئەم" کتێبەکەی شاری خودا " بە فعلی" یەکەم هەوڵدانی گەورەیە بۆ فەلسەفەی تاریخ ـ مێژوو" کە تیایدا ژیانی مرۆڤایەتی بە هێنراوەیەکی سەیرو سەمەرە دەشۆبهێنرێت ـ لە دیدی ئەو"ئۆگۆستین" دا ـ چەمکێکی مێژوویی وەردەگرێت کاتێك کە لەو عەقیدە فیداکارییە هەڵدەقوڵێت کە بە ئادەمیزاد ـ مرۆڤ بەخشراوە" وەك ئەوەی کە پێشتر بە سەریدا ڕۆیشتین".





**٨- هونەر (جوانی، گۆرانی، شانۆ، پەروەردە و مۆسیقا):** هونەر لە جوانی یەزدانەوە وەردەگیرێت و سەرچاوەکەی ئەوە، هونەریش خالقە بە و ئەندازەیەی کە لە خواوەندی خالقی هەموو شتێکەوە سەرچاوە دەگرێ. یاسایەکانی لە نێو یاسای هەمیشەیدا ژمارەدار کراوە. قەشە ئۆگۆستین لە هونەرەکان هۆکارێکی نوێ دەدۆزێتەوە بۆ شکۆمەندکردنی خواوەند و ستران چڕین بۆ سۆپاس گوزارکردنی. چونکە جوانییەکان، هەموو جوانییەك، جوانی خۆی لە جوانی سەروی خۆی وەردەگرێت، ئەوەی کە لە ناخەکان بەرزترە و شتەکان لە شەو و رۆژدا بۆ ئەو بەرەو ئەو بەرزدەبنەوە.

لەگونجان بەگشتی جوانی ـ جوانی هونەر ـ دروست دەبێت واتە بە رێککەوتنی گشتی و گونجانی بەشەکان و تەبایی بوونیان. ئۆگۆستین کتێبێکی دوور و درێژی لەسەر ئەم بابەتە بەناوەی"(الجميل و المتناسب) واتە"جوان و هاوشێوە" دانابوو، بەلأم دواتر وون بوو"بەبێ ئەوەی بزانرێت کەی و چۆن ونبووە وەك ئەوەی لە گوتەکانی دانەری ئەم کتێبەدا دیارە".

باس لە گۆرانی گۆتن و دلڕمێنی ئەو دەکات، ودەلێت: "...هەروەها ویمڕۆش دان بەوە دادەنێم. کەمن زۆر بە چێژەوە گوێبیستی ئەو گۆرانییەم کە لەگەلٚ گوتەکانتدایە (مەبەستی خواوەند) کاتێك ئەو دەنگەی دەپچڕی بەسۆز و بەباشی دەری دەبڕی. دواتر درێژە دەدات: بە تەواوی دا هەست دەکەم کە ئەم



گۆتە پیرۆزانە لە نەفسەکاندا بە هۆی کاریگەری بلێسەی (تەقوا) و خۆپاراستن کۆمەلێك هەست و سۆزی وەئاگاهێنەرەوە و دلٚ خەبەردار کەرەوە بەرهەم دەهێنن کە ئەگەر ئاوازدار بێت (ئەو گۆرانی یانە ئەو گوتانە) ئەوە ئایینی تر و بە تین تر دەبن بە بەراورد لەگەلٚ بێ ئاوازیدا. بەلأم ئۆگۆستین ئیشارەت بۆ مەترسییەکانی گۆرانی و تنیش دەکات کاتێك کە لە رادەبەدەر بەکاردێت و زێدە رۆیی تێدا دەکرێت بەبێ ئەوەی ئەمە لە سوود و کەلٚکی کەم بکاتەوە بۆ لە خودا ترسان و خوداپەرستی. قەشە"ئۆگۆستین" لە کتێبی "الاعترافات"دا بە تێروانینی بەپێزی سەبارەت بە شانۆ هەیە و هەستی بە ئاشنایی و سەرنج راکێشانێکی یەکجار زۆری دەکرد لەگەلٚە ئەو بەشە شانۆییانەی کە باسیان لە ئازار و زامەکاندا دەکرد. شیکردنەوەییەکی زۆر شیرینی هەیە بۆ چێژ وەرگرتن لە دراما. بیروبۆچونەکانی دەربارەی پەروەردە کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەفلاتونییەتی نوێخوازەوە و بەوەی کە لە سەردەمی ئەودا باو بووە لەلایەن بیرمەندە رۆمانییەکان کە بانگەوازییان دەکرد ـ بۆ نموونە ـ بۆ هەندێك ئامۆژگاری گشتی وەك لێبوردەی و نەرمی نواندن بە مەبەستی گەشەکردنی مندالٚ بە شێوەیەك کە بە دروستیان زانیووە... بەلأم ئۆگۆستین لە کارە کۆتاییەکانی کۆمەلێك راو و بۆچوونی تایبەت بە پەروەردەکردنی ئایینی وەزارەتی ئەم پەروەردەیە و ئەرکی کەسی دابینکردنی بۆ مندالأن کۆمەلێك رای پەروەردەی لەم





بابەتانە لەلای گەلاڵەیان کردوو جەختی لەسەر کردنەوە ئەم رایانە ئیمڕۆش لەلایەن کۆمەڵێك بیرمەندی پەروەردەی لە لەتراسەوە تیۆرەکانیان وەردەگرن پێشوازی لێدەکرێت.

لە کۆتاییدا، لە ئاوازدا یا مۆسیقا، کە دیارە لەم بوارە وەکو پێویست نەخوێندراوە تاکو ئێستاش (کە ئەمە بیرۆکەیەکی ئۆگۆستینییە پێویست بە گەڕانەوەیەکی زۆر دەکات) و زۆربەی راکانی بەشاردراوەی ماونەتەوە -بەلاّم لە توێژینەوە نوییەکان- بە تایبەتی ئەڵمانییەکان -دەبینین کە چۆن شوێنکەوتووی و باوەڕهێنان و وەرچەرخاندنی دەخوێنن لە ژێر رۆشنایی بەرهەمەکانی یا نووسراوەکانی سەبارەت بە مۆسیقا. لە تاوتوێکردنێك دەربارەی مۆسیقا دەڵێت- لە"المحاورات الفلسفیە" دا کە لە ساڵی ٤٨٠ نووسراوە: مۆسیقا زانستێکی بەرزەو کاری ئەقڵە، بەبێ ئەم زانستە ئەوە مۆسیقا دەبوو بە چێژوەرگرتنێکی ئاژەڵیانە و قێزلێ بۆوە دەبوو".

**٩- هونەر و توانایی هەبوون لەلای ئادەمیزاد(مرۆڤ)، دیالێکتیك (الجدل):** لەو کاتەی کە سروشت نەگۆرە و پێشتر سیماگشتییەکانی (معالمە) سنووردارکراوە و بەو پێشکەوتنەی کە تیایدا روویداوە دەزانین و زانایین، دەبینین کە هونەر (پیشەسازی) -ئەگەر پەیوەندیداریش بێت بە سروشت و بەبێ ئەو نییەتەکایەوە-



هەڵدەستێت بە چاپکردنی توانای دروستبوون و هەبوون (امکانیة الوجود) تیایدا (لە سروشت).

ئەمە وادەگەیەنێت، لەدیدی ئۆگۆستین، ئەو مرۆڤەی کە خۆی یەکێکە لە تواناکانی بوون هونەر هەڵدەستێت و یەکێك لە تواناکانی تیادا چاپ دەکات بە پێی جۆری ئەو هونەرە. لێرەدا ئێمە دوو جۆرە هونەرە(پیشەسازی) مان هەیە، یەکەم: پیشەسازی تەرویزی ـ تەرفهی کە لەسەر گیانلەبەرەکان دەسەپێت.

جۆری دووەمیان پیشەسازی دەستییە و پیشەسازی لێرەدا بە واتا هونەریەکەی. وپیشەسازی یاخود هەنەر بەواتای زانست یا بەشێك (لقێك) لە زانستی. واتا کۆتاییەکە (کە مەبەست زانستە) دووجۆر لە هونەر دەگرێتە خۆی کە دیالێکتیك (جدل ٩ و مۆسیقایە. لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا* زانیمان کە مەبەست لە حەوت هونەرە ئازادەکان چین و چی بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

سەبارەت بە دیالێکتیك (جدل)، لە دیدگای ئۆگۆستین، گرنگییەکی لەرادە بەدەری هەیە، و پیشەسازی پیشەسازییەکانە، و هونەری سەرتاپای هونەرە. ئەو وادەکات کە ئێمە بزانین، چونکە ئێمە لە رێگای گفتوگۆ فێردەبین و جەدەل فێرمان دەکات کە چۆن فێرببین

* ئەم بەشەی ئاماژەی پێکراوە وەرنەگێردراوە.





و فێربکەین، و چۆن تێ بگەین و تێ بگەیەنین. هەروەها فێربوون و تێگەیشتن لەسەر ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان فێرکارو داواکار (داواکاری زانست) -مرید- وەستاوە و لەسەر پرسیارکردن و وەڵامدانەوە بوونیاد دەکرێت.

بەڵکو ناسینی خودی زانستیش بەم ڕێگایە ئەنجام دەدرێت، مرۆڤ گفتوگۆیەك ئەنجام دەدات لە ناخی خۆی لە نێوان هەموو زاندراو و نەزاندراوەکان. لە ڕێگای گفتوگۆکردن، ئەوەی کە خاوەنی شوێنگەیەکی بەرزە لە بیرکردنەوەی ئۆگۆستینی، مرۆڤ بەرزدەبێتەوە پێش دەکەوێت و خۆی پێدەگەیەنێت و دەسەپێت. گفتوگۆکردن ـ کە بە هۆی یا لە ڕێگای جەدەلەوە ئەنجام دەدرێت ـ زانستێکە نەوەك ڕێگایەك یا شێوازێکی هونەری وەك ئەوەی ئیمڕۆ ئێمە وای دادەنێین. بە هەمان شێوە مۆسیقا ـ زانستە نەك شێوازێکی هونەری. گرنگی مۆسیقا. وەك گرنگی جەدوەل لە شوێنگییەکی زۆر بەرز دانراوە و کە لە پێشتریش باسمان لێوەکرد.

لە کۆتاییدا، لەبیرمان ناچێت، باسی ئەو گرنگی پێدانە(گەورەیە) دەکەین کە، ئۆگۆستین، داویەتە پاڵ لە چاوکردنەوە (تقلید)، و کاریگەرێتی، و چالاکییەکانی لەسەر ئەم هونەرانە.

**١٠- دید و ڕوانینی بۆ کتێبی، پیرۆز، و تیۆرەکەی لە لێکدانەوەدا:** بینیمان کە ئەو لە نۆزدە هەمێن ساڵی تەمەنیدا بوو



کاتێك کە یەکلای کردەوە ئەقڵی خۆی لە کتێبە پیرۆزەکان بەکاربهێنێت. بزانێت نرخ و بەهایان چییە.

ئۆگۆستین نەی توانی لەوساتانەدا قبوڵیان کات، و سەریان بۆ دانەوێنێت و لە ژێر سایەیان ڕووە و پێش بڕوات. پێی وابوو کە ئاست بە ڕاوردکاری دانین لەگەڵ شۆمەندی ڕێبازی شیشرۆنی، و بەم شێوەیە زمانە ساکارەکەی ئەسفارەکانی (ئنجیل)ی بەبێ نرخ زانی و دیدی ئەو نەیتوانی بە ڕەو قوڵاییی و ناخیان بچێتە خوار.

بەڵام. دوای دوازدە ساڵ لەم مێژووە یا ڕۆژگارە، وازی لە هەڵوێستەکەی هێنا. ڕۆژێکیان کاتێك کە بە ئامۆگارییەکانی قەشە"ئیمبرواز" وە خەریکبوو(ئەوەی بە زمانپاراوی و بە هێزی ڕوونکردنەوەکانی ناسراوە) بە شێوەیەکی کتوپڕانە چەوتی بیروباوەڕەکانی(اعتقادات) پێشتری خۆی بۆ دەرکەوت.

باوەڕی بەوەهێنا کە کاسۆلییەت دەتوانێت لە بەرامبەر هێرشە مانەوییەکان بوەستێت، و بەرگری لە خۆی بکات.

هێندەی تر باوەڕی بەمە زێتر دەبوو هەرکە گوێبیستی ڕاڤەکردنە هێماییەکەی (الشرح الرمزی) ئەو پارچە و ئەم پارچە دەبوو لە تەوراتی (العهد القدیم) لە کاتێکدا کە ڕاڤەکردنە وشەییەکەی (التفسیرالحرفی) تەورات بەلای ئۆگۆستینۆسەوە شان قورسکار و دوورکەرەوە بوو.





بەم جۆرە جارێکیتر گەڕاوە بۆ ئەوەی ئەم جارەیان بە دڵێکی کراوە بیخوێنێتەوە و بەکتێبی کتێبەکانی بزانێت، و لە هەمووکتێبی فەیلەسووفەکانی بە بەرزتر دابنێت و پێویست لادەربێت بۆ گشتیان.

ئەم کتێبەی(ئنجیلی) بە دانانی یەزدانی زانی و رۆحی قودسیش وشە بە وشە پڕی کردوتەوە(نووسیویەتەوە) کەوابێ ئەم کتێبە هیچ هەڵەیێکی تیادا نییە. بەڵام لە لایەکی ترەوە، ئەو باوەڕی بەوە هێناکە کتێبی پیرۆز ئەگەر لە کاتێکی دیاریکراودا لەلایەن خەڵکانێك کە کەوتبێتەژێر کاریگەری پێداویستییەکانی ژیان و بەزمان و وشە ئادەمیزادییەکانیان نووسرابێتەوە، ئەوە بێگومان پڕیان کردووە لە تەم و موژ و نادیاری، بەڵکو زێتریش لەمە ـ بەهۆی کەم توانایی وەرگێڕەکان و کورتی لەکاری چاپکەرەکانی ـ پڕیان کردووە لە هەڵە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئۆگۆستین بەرزترین ئایەتی رێزلێنان و بەگەورە زانینی بۆ کتێبی پیرۆز هەڵنەگرتووە، وەلێ زۆرینەی دێڕەکانی لەپشتی دڵییەوە لە ئەزبەرکردبوو، نەدەساڵییەوە لەگەڕانەوە بۆیان هەرکاتێك کە پێویستی پێیان بوایە. ئەمە لە کتێبی (الاعترافات) بۆ رۆندەبێتەوە، چونکە لەم کتێبەدا کۆمەڵە ئایەتێکی زۆر و زەوەند بەدی دەکەین کە لاپەڕەکانی رازانەوتەوە، یارمەتی دەری دانەرە بۆ راپتەوکردن، ئەو ژێدەری بەشێوەیەکی لە خۆوە و بەبێ ئەوەی مەبەستدار بێت یا خود بە دوایەوە بگەڕێت لەم ئایەتانە



وەردەگرێت. بەم پێیە لە"اعترافات" دەبینین کە ٧٤ جار بۆ سفری تەکوین (سفر التکوین) گەڕاوەتەوە و ١٠ جاربۆ(سفرالخروج)، و ٨ جار بۆ(سفر التشنیه)، و٣٨٩ جار بۆ(المزامیر) و ١٧ جار بۆ(الامسال)، و٦ جار بۆ(نشیرالانشاد)، الخ...و ٨٣ جار بۆ (انجیل متی)، و ٧ جار بۆ(انجیل القدیس مرقصی)، و ٣٣ جار بۆ(انجیل القدیس لوقا)... ئۆگۆستین چەند رایەکی دەربارەی (الکتاب المقدس) هەبوو، کە لەو کاتەدا زەرورەی و پێویستابوون، لەوانە:

ا- لێکۆڵینەوە لە تێکست: لەڕاستیدا، وەرگێڕانی کتێبی پیرۆز (انجیل) بەزمانی لاتینی یەکجار زۆر بوو، ئەم زۆریەش لەلای بیرمەند شتێکی خۆش نەبوو، هەرچەندە رێگە خۆشکەریش بوو بۆ ئەگەری بە راورد و چاودێرکاری وردتر و فرە لایەنتر بۆ هەر تێکستێك. ئەو وەرگێڕانەی کە لە کڵێساکانی ئیتالیا کاریپێ دەکرا، و بە"ئیتالا" ناونرا بوو، ئۆگۆستین ئەمەیانی پەسندکرد کە راستەوخۆ لە" السبعینیة" وەرگێڕدرابەوە. ئۆگۆستین پێی وابوو کە ئەمەیان وەك تێکستی رەسەن بە تەواوی سروش کاوە. هەر بۆیە دەگەڕایەوە بۆ"السبعینیة" کاتێك هەر نادیارییەکی لە"ئیتالا" رووبەڕوو دەبۆوە، یا بە مەبەستی بەراووردکردن. سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بە"العهد الجدید" ئنجیلیشەوە هەیە بۆ ئەو مەبەستە دەگەڕایەوە بۆ دەستنووسە یۆنانییەکان، بۆ ئەم"ئیتالا" یە، و بۆ ئەو وەرگێڕانەوەی کە قەشە جیرۆم پێی هەڵستا بوو.





ب ـ دیاریکردنی وردی واتا: له دوایی لێکۆڵینه و له تێکست، قەشە ئۆگۆستین دەچووەسەر دیاریکردنی واتاکەی بە ووردی. ئەمەیانە کەداوای باوەڕدارییەکی بەوەدەکات کە وا ئەم کتێبە کتێبی راستی و شەریعەتە، و پێویستی بە زانیاری سەبارەت بەسەرجەم زانستە مرۆییەکان (زانستی زمان، و مێژوو، زانستی گەردووناسی، رووەك، و کانزاکان، و وتاربێژی... هتد) دەکات (بۆ مەبەستی دیاریکردنی واتاکەی). لەکۆتاییدا، پێویست بەدیارکردنی واتا هەیە، دیارکردنی نووسەر بۆ ئامانجەکەی، کە ئایا واتا وشەییەکەی (حرفی) مەبەستە یاخود واتا مەجازی یەکەی؟

ج ـ واتای وشە بە ووشە(المعنی الحرفی): بۆ تێگەیشتن لەم واتایە تێگەیشتن لەم واتایە تێگەیشتنێکی تەواو و کامڵ هیچ رێگایەك نییە جگە لە پشکنینی رستەکە لە رووی مێژووەوە. واتا گەرانەوەو دانانی جارێکی تر لە چوارچێوە مێژووییەکەیدا، و تێگەیشتن لەو رووداوانەی کە بوونەتە هۆی (ئەوانەی دەستیان لەو مانایە (المعنی الحرفی) و دروستبوونی هەیە)، دواتر ووردبوونەوە لێیان، و سەرنجدانیان لە دیدگای هۆکارو چ ویستییەکان بۆی (مەبەست بۆ مانا حەرفییەکە) بە مەبەستی زانینی ئەو فەرمایشتانەی کە تیایدا هەیە، دواتر توێژینەوە لێیان لە روانگەیەکی بەراوردکاری بۆ ئەوەی روونبکرێنەوە چ لە رێگای پێوەرکاری یا لە رێگەی لێکچوون و هاوشێوەییان بێت لەگەڵ پارچەکانی تردا.





ئەوەی سەرنج راکێشە لێرەدا بیروڕای ئۆگۆستینە سەبارەت بە هەبوونی کۆمەڵێك واتا یا مانای حەرفی بۆ یەك تێکست (لەبەرامبەر ئەمەدا و دژ بەو رایە، رای تۆماس هەیە) بەمەرجێك کە دژاودژنەبێتەوە لەگەڵ باوەڕدا، و دژ بە ئاینترا نەبێت و نە بێتە هۆی گاڵتە جاری بە تێکستەکانەوە لەلایەن بێ باوەڕان.

د ـ مانای مەجازی: ئەمەیان مانایێکی وردتر و ماندووبوونی زۆرترە. لە زۆربەی رووداوەکان (مەبەست ئەو رووداوانەی کە لە کتێبی پیرۆزدا باسکراون) داهەیە، و بە شێوەی خواستن و تەسویر و بە شێوەیەکی مەجازی دراون:

هەروەها ئەو لە زۆرکاتدا زەروری یە بۆ تێگەیشتن لە واتا وشەییەکە شاردراوەو نادیارە، ئەمە جگە لەوەی هەندێك جار چەند تێکستێك هەن کە مانای رۆحی هەڵدەگرن، یا نیشانەی پێشبینی کردنی(نبوئیە) تێدایە...هتد.

هـ ـ هەڵوێستی ناوەند: ئەمەیان ئەوە دەگەیەنێت کە هەڵەیە ئێمە جگە لەمانا وشەیی حەرفییەکە هیچی تر نە بینین (هەروەك مانە وییەکان) لە کتێبدا، و خۆمان بە دەلالەت و مانا دەرەکی و دیارەکان ببەستینەوە. هەروەها هەڵەشە کە ئێمە (تێکستەکان) وەك کۆمەڵە چیرۆکێکی رەمزی وەریان بگرین و وەك خواستن و پێکچواندی (تەشابیهی) تەئویلی سەیریان بکەین. لە کۆتاییدا، قەشە ئۆگۆستین بۆشیکردنەوە راڤەکردنی کتێبی پیرۆز کاریگەربوو

و دڵگیربوو بەو شیکردنەوە"رۆحی"یەی کە لەلای قەشە"ئمبرواز" هەبوو. ئەمیشیان ئەم شێوە شیکردنەوەی لە" ئۆریجا نۆس" خواستبوو. لە راستیدا، ئەم شێوەیە (بۆ شیکردنەوە) تایبەت نییە بە تێکستە ئایینی یا خود(تێکستە دامەزراوی و مەسیحی‌یەکان وە، چونکە دەبینین کە رەواقی‌یەکان بەکاریان دەهێنا بۆ شیکردنەوەیان بۆ تێکستەکانی هۆمیرۆس یابۆ غەیری ئەو، هەتاکو ئێستاش پەیڕەودەکرێت.

**١١- سۆفیگەری ئۆگۆستینی:** بێ گومان لە" اعترافات"بۆنی سۆفیگەری دەکەین ، کاتێك کە لە زۆربەری لاپەرەکانیدا وەسفی چۆنیەتی بەرزبوونەوەی خۆی و هەوڵدانی بۆ نزیکبوونەوە لەیەزدان دەکات، و کەلێن و قوژبیی ئەزموونە ئایینی یەکەی و چەلمە سەری‌یە رۆحییەکەی باس دەکات هەروەها ئاماژە بۆ ئەو بەسەرهات و حاڵەتە جۆراوجۆرانە دەکات لە پێیاندا رۆیشتەوە... هەر ئەمانەش بووەکە کردوویانە بە گەورەی سۆفی‌یەکان. بەڵام هەندێك لە شیکەرەوەکان ئۆگۆستینییەت ئەم رایەڕەت دەکەنەوە بە بەهانەی ئەوەی کە سۆفیەتگەری زانستێکی لە بوتەدراوەو توندە (علم صارم)، کۆمەڵە یاسایکی هەیە، و تێرامینێکی نێگەتیڤانە و بێ کاریگەرە، و بە لێشاوە هاتنی کاتێك کە دێت، هەموو چالاکی‌یەکانی نەفسی دەوەشێنێت و ناهێلێت سۆفی بە هیچ کاریگەربێت جگە لە رۆحی پیرۆز، ئەمە لە کاتێکدا کە



تێرامینەکانی ئۆگستین چالاکانەو وەرگێراوبوو و گشت تێرامینەکانی لەم شێوە بوون ئەوەی لە سۆفیەتی دەبینن لە "اعترافات" راستە، هەروەها راستە کە تەسەوف ـ بە شێوەیەکی گشتیـ کۆمەڵە حالەتێکی نێگەتیڤانەیە. سەبارەت بە قەشە ئۆگستین ئەوە سۆفیگەریەتی لەلای ئەو ئەگەر ئەم دەربڕینە دروست بێت- لەسەر بنچینەێکی کردەی (علمی) و واقیعی دەوەستێت. لە ژیانیدا"هەرگیز وازی لەم جیهانە نەهێناوە. هیچ کاتێك کارکردنی و چالاکی رەتنەکردوتەوەو ئەمەیە تەسەوفی راستەقینە، کە واقیع رۆشن دەکاتەوە بەبێ ئەوەی کە قبوڵی نەکات یان نەفرەتی لێ بکات، ئەوەی کە بەردەوامە لە ئەم لاو ئەولا و لە جووڵە دایە و هاتووچۆ دەکات لە واقیع بۆ ئایدیالیزم وە بە پێچەوانەشەوە...



